# کوردستان

## بۆ ویران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە ؟!

نووسینی : علی باپیر

١٤٠٩ ک - ١٩٨٩ ز

" وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُوا وَاتَّقَوا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَرَكَاتٍ مِنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ وَلَكِنْ كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُمْ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ "

# پێشەکی



١ـ بە هەموو موسوڵمانێک کە دەزانێ ( خواپەرستی ) و ( خەڵک دۆستی) دوو ڕووی بەرنامەی خودان .
٢ـ بە هەموو ئیسلامی‌یەکی پارێزکارو جەرگدار کە ئیمان و ویژدانی ئیسلامی‌یانەی مۆڵەتی نادەن لە واقیعی پڕ ئیش و ژانی گەلی چەوساوەو بێکەس و کەساس و بێ شوانی‌یەوە ڕامێنێ و دەست لە ئەژنۆیان وەربێنێ !!
٣ـ بە هەموو کوردێکی ژیرو ڕەسەن کە بۆ هەنگاونان و تێ هەڵچوونەوەی داهاتوو پەند لە تێشکان و بەربوونەوەی ڕابردوو وەردەگرێ و ، نایەڵێ دووجاران (١) لە

(١) بێگومان پێوەدرانی کورد لە (کون) ی

## کونێکەوە پێیەوە بدرێ !!



---

روو لە غەیری ئیسلام کردنەوە، لە دوو جاروسێ جاران هەڵبردوە، بەڵام هەر پەندەکە بەو شێوەیە، ئەو پەندەش فەرموودەیەکی پێغەمبەری مەزنە صلی اللە علیە وآلە وسلم کە دەفەرموێ :
( لایُلدَغُ المُؤمِنُ مِنْ جُحْرٍ واحِدٍ مرَّتَیْن ) .
رواه الشیخان وابوداودٔ وابن ماجە .

# چەند تێبینی یەکی کوردستان

١ــ ئێمە کە لێرەدا هۆیەکانی وێران بوونی کوردستان و ڕێگەی ئاوەدان کردنــەوەی دەخەینە سەر خوانی لێکۆڵینەوە ،وەنەبێ لە وێرانیی تێکرای دنیاش بێ هــەواڵ بین ، چونکە وێرانیی ڕاستەقینە وێران بوونی مەعنەوییەو ، سەرلەبەری جیهانیش لەم ڕووەوە خاپوورە ، وە هەمان حوکم کە بەسەر کوردستان دا دەچەسپێ ، چ لەڕووی هۆی کاول بوون و چ لەڕووی چۆنیەتــی ئاوەدان کردنەوەوە ، بەسەر پارچەکانــی دیکەی جیهانیش دا دەچەسپێ .

٢ــ هەرچەندە ئێمە لـــــە زۆر ڕووەوە سەرلەبەری کوردستان بە وێران کـــراو دەبینین ، کە کوت‌کوت‌کرانی و دابــەش کرانی یەکێکە لەو ڕووە هەرە زەقانە ،

بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئەو وێرانیو کەساسیەی لە بەشە کوردستانی سەر بە عێراق دا لە هەموو بەشەکانی دیکەی بەرچاوترە، لێکۆڵینەوەکەمان زیاتر پەیوەستە بەوێوە.

٣- هیوادارم هەر لە سەرەتاوە هەموومان بەوپەڕی سینگ فراوانیو خۆبەکەم گرتنەوە، دان بە هەڵەو تاوانی خۆماندا بنێین و، هیچمان هێندە خۆمان بە بەرز نەگرین کە وابزانین فریشتەی بێ هەڵەو بەفری بێ پەڵەین، بۆئەوەی ئەگەر دوایی هەندێک ڕەخنەو تێبینی ڕوویان تێ کردین، پێمان شتێکی چاوەڕوان نەکراو نەبێو کێچمان نەکەوێتە کەوڵیو قەڵس نەبین.

٤- هەرچی لێرەدا نووسیومە بیروبۆچوون و تێڕوانینی تایبەتی خۆمە لەبەر تیشکی قورئان و سوننەت و واقیعی ڕابردوو و ئێستادا، جا ئەگەر هەڵەوناتەواویەکی

تێدا بێت - بە بۆچوونی هەندێک کەس- ئەوە با بزانێ هەڵەو ناتەواوی یەکە لەمنەوەیەو ئیسلام لێی بەری یە ، وە جگە لەخۆم هیچ کەسیش لەو ڕووەوە بەرپرسیار نیە .

# پێشەکی

خوێنەری بەڕێز !

لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ئینسان جێ نشین ( خلیفة ) ی خوایە ، لەسەر زەوی ، وەک خودای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ( وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً .. ) البقرە / ٣٠.

واتە : وە کاتێک پەروەردگارت بە فریشتانی فەرموو ، بێگومان من جێ نشینێک لەسەر زەوی دادەنێم ..

ئنجا لەسۆنگەی ئەوەوە کە فریشتە پاک و بێگەردەکان سەلامی خوایان لێ بێ دەیانزانی کە ئەرکی جێ نشینایەتی لەسەر زەوی ، لە بەڕێوەبردنی کاروباری دنیا و ئاوەدان کردنەوەی دا خۆی دەنوێنێ ، وە دەشیان زانی کە ئینسان

دەماری تووڕەیی و هەوا و ئـــارەزووی تێدا پەو گومانیان وابوو، کە ئەو ئەرکە پیرۆزە بە ئینسان بەڕێوە ناچێ، لــە وەڵامی فەرمودەی خوادا وەک پرسیـــارو داواکردنی ڕوونکردنەوە ( الاستفسار ) گوتیان :( أتَجْعَلُ فِيْهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيْهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ .. ؟! ) ئایا لەبەرچـــی یەکێکی تێدا دەگێڕی ـ بە جێ نشیـــن ـ کە خراپەی تێدا دەکات و خوێنـــــی دەڕێژێ .. ؟!

بەڵام خوای زاناو کاربەجێ کە دەیزانی ئینسان وێڕای توانا و هێزی خراپەکاری و تاوان ، توانا و وزەی چاکەکـــاری و ئاوەدان کردنەوەشی تێدایە ، لـــە وەڵامیان دا فەرمووی :( إِنِّي أعْلَمُ مَـالا تَعْلَمُونَ ) ئەوەی من دەیزانم ئێـــوە نایزانن !

بەڵێ ئەرکی ئینسان لە ژیانـــی دنیای دا بریتیە لە جێ نشینایەتـــی

خواو ئاوەدان کردنەوەی سەرزەوی بەهۆی چەسپاندن و بەڕێوەبردنی حوکم و بەرنامەی خواوە، وەک لە سوورەتی ( هود ) دا بە ڕاشکاوی فەرموویەتی :( .. اعبدوا اللە ما لكم من إلهٍ غيرُه، هو أنشأكم من الأرض واستعمركم فيها .. ) / ٦١ .

واتە : .. خوا بپەرستن جگە لەوی هیچ خواتان نین ، ئەوە کە لە زەوی دروستی کردوون و ئێوەی لەوێ دا گێڕاوە بە ئاوەدان کەرەوە ..

جا مادام حیکمەت و هۆی دروست بوونی ئینسان و هاتنەدی ئەم ژیانە دنیاییە بریتی بێ لە ئاوەدان کردنەوەی زەوی و بەڕێوەبردنی حوکم و بەرنامەی خوا ، مانای وایە هەموو دەمێ دیتنی دیاردەی ئاوەدانی و خێروخۆشی و بەختەوەری لە ژیانی مرۆڤایەتی دا بەگشتی و لە یەک یەکی کۆمەڵگایەکانی سەرزەوی دا بەتایبەتی، بەڵگەو نیشانەی ساغ وسەلیمی

مرۆڤایەتیو گەل و تیرەکانـــــەو ، بە پێچەوانەوەش دیترانی دیاردەی وێرانیو خراپەکاری و ژینتاڵی نیشانـــــــەو درووشمی نەساغیو نەخۆشیو لەگریێ ژەنە چوون و لەڕێ دەرچوونیانە !

دەجا ( کوردستان ) بەگشتیو بەشـــە کوردستانی سەر بە عێراق بەتایبەتــــی کە یەکێکە لە پارچەکانی سەرزەوی و ، دانیشتووانیشی یەکێکن لەو نەتـــەوەو گەلانەی کە مرۆڤایەتییان لێ پێک دێ ، لەم ڕۆژگارەدا زەق ترین و بەرچــــاو ترین و بێپەزاترین شێوەی دیـــاردەی کاول بوون و وێرانکاری و ژینتالـــــی بەخۆیەوە دەبینێ .

ئنجا گومانی تێدا نیە کە هیـــچ دیاردەیەکی ماددی مەعنەوی نیە کـــە هۆو بنەمایەکی تایبەتی نەبێ، چونکـــە مەحاڵە هیچ شتێکی پەیدابوو لەخـــۆوەو بەبێ هۆ پەیدابێو سەر هەڵ بدات .

جا بەندە لێرەدا وەک جێبەجێ کردنی ئەندازەیەک لە ئەرکی سەرشانی بەرانبەر بەرنامەکەی و، وەک دەربڕینو سەلماندنی ئەمەگ و وەفاو پەرۆش و بەتەنگەوەبوون سەبارەت بە گەل و نیشتمانەکەی، ویستی کە زۆر بە کورتیو گوشراوی لە دووتوێی ئەم نامیلکەیەدا لە چەند خاڵێکدا هۆو بنەمایەکانی وێرانیو کاول کرانی کوردستان و ژینتاڵیو بێ حاڵی دانیشتووانی بتوێژێتەوەو، پاشانیش هەر بە کورتی ڕێگەو چۆنیەتی ئاوەدان کردنەوەی کوردستانی وێران و، بووژاندنەوەی کوردی بێ شوان بخاتەڕوو.

هیواداریشم تێکڕای گەلە چەوساوەو ماندووەکەم بە هەموو بەش و چین و توێژەکانییەوە بەتایبەتی ئەوانەی کە خولیاو کەڵکەڵەی ئازادی و ڕزگاری کوردو کوردستانیان لە کەللەدایەو، خۆیان بە شۆڕشگێڕو مشوورخۆری گەلەکەیان

دەزانن ، زۆر بە هێدی و ئارامـــی و
بەویژدان و بە دڵێکی بێ خلـتــــەوە
بیخوێننەوەو، ڕێگە بە هەست و نەست و
دەمارگیری حیزبایەتی نەدەن ، کـــە
بە چەنگە خۆلی ( بەدگومانی ) و ( بەس
خۆدیتن ) گۆمی ڕوونی زەینیان قـــوڕاو
بکات و، تێگەیشتن و لێ حالی بوونـــی
مەنتیقییانەیان لەدەست بـــدات و ،
گیرۆدەی تێڕوانین و هەڵوێستی بـــە
بوغزو غەرەزو سەرکێلانەی ئیشـــک و
بێ تامیان بکات .

وە هیوادارم کە قەناعەت هێنانـــی
پێش بیرکردنەوە وا لە هیچ کەس نەکات ،
کە خۆی بکاتە دارکەری شەوێ و ، بـــە
پێخواسی وەنێوبکەوێ و، هەر لەخـــۆوە
خەونی خراپ ببینێ و، ڕاست وچەپ (x) ی
نەویستن بەسەر ئەو ڕاستییانەدا بێنێ،
کە لەگەڵ بیروبۆچوون و ڕێرەو ( اتجاه )ی
چەوت و هەڵەی وی دا ڕوو بەڕوو دەبنەوە ،

چونکە خوا لەسەرڕا ئاگادارە لـــــــە نووسینی ئەم نامیلکەیەو هەر بەرهەمێکی دیکەشمدا بێجگە لە خوا لەخۆ ڕازی کردن بەهۆی لابردنی چاوبڕێچکی سەر چـــاوی گەلەکەمو دەستگرتنیو ڕێپڕوونی کردنـی بەرەو ڕێبازو بەرنامەیەک کە عیززەتو سەربەرزی و خێروخۆشیو بەختەوەری دنیا دواڕۆژانی لەگرەو دایە، هیچ نیـــازو مەبەستێکی دیکەم لەدڵ دا نیەو، جگـــە لە بیروبۆچوونی چەوتو هەڵەو ڕێچکـەو کوێرە ڕێ ی خواروخێچو ڕەنجبەزایەدەرو بەئامانجنەگەیەنەریش شەڕو دەعـــــوام لەگەڵ هیچ کەسدا نیە، جا لەبەرئـەوە ئومێدم وایە کە هەرچەندە جـــارجـــار ( تالی ی ) و ( ڕەقیی ) ئـــــەو ڕاستییانەی دەیانخەمەڕوو دڵی هەندێک کەسیش تێکەڵ بێنن و ئازار بـــــدەن ، دڵسوزی و نیازپاکیو گەل دۆستیـــــم شەفاعەتم بۆ بکەن و داوای گـــــەردن

ئازاییم بۆ لەو کەسانە بکەن .

قوولە هەرمێ / بەشە کوردستانی سەر بە عێراق

١٧/ ذو القعدە/ ١٤٠٩ کۆچی
١٨/ حوزەیرانی / ١٩٨٩ زایینی

# بۆ خۆشکردن
# چۆن ڕووداو و کارەساتەکانی مێژوو تەفسیر بکەین ؟!

هەر لەکۆنەوە لەنێو توێژەرەوەو مێژوونانان دا سەبارەت بە چۆنیەتی تەفسیرکردن و شیکردنەوەی ڕووداوو کارەساتەکانی مێژوو مشتومڕو جیاوازی بیروڕاو بۆچوون هەبووە .

هەبووە بەس دەوری تاک ( فرد ) ی ڕەچاو کردوەو ، هیچ ڕۆڵێکی بە بەژن و باڵای کۆمەڵگا ( مجتمع ) ڕەوا نەدیوە ، وە بە پێچەوانەوە هەش بووە تەنیا دەوری کۆمەڵگای لەبەرچاو گرتووەو ، هیچ حیسابێکی بۆ دەوری تاک نەکردوە .

وە هەبووە کە غەریزەی جینسی بە دینەمۆو پاڵنەری مێژووی مرۆڤایەتی و پەیدابوونی ڕووداوو گۆڕانکاریەکانی ژیانی لەقەڵەم داوە ، بۆ وێنە (فرۆید) !

هەشیان بووە کە غەریزەی زەبروزەنگ نواندن و دەستەڵات ڕانانی بە تەلیسمی مێژووی ئینسانەکان داناوە، بۆ وێنە : ( نێیتشە ) .

( داروێن ) یش لە ڕوانگەی بەئازەڵ حیسێب کردنی مرۆڤەوە، هەوڵی داوە هەموو جموجۆڵ و وردو درشتی تاک و کۆمەڵ لەسەر بنچینەی : بەشەڕهاتن و چەنگەپرچە لەسەر مانەوە ( التَنازُعُ عَلىٰ البَقاءِ ) و، مانەوە بەس بۆ بەهێزترە ( البَقاءُ لِلأقوىٰ ) تەفسیر بکات .

( مارکس ) یش بە هیچ کام لەو بیرو بۆچوونانەی پێشەوە قایل نەبووەو هەموویانی بە هەڵە داناوەو، ئەمیش لەسەر بنچینەی بێ بڕوایی و جگە لە ماددە بڕوا بە هیچ نەبوون،ویستوویەتی هەموو دیاردە ماددی و مەعنەوی یە جۆراوجۆرەکانی ژیانی ئینسان ، هەر

لە سەرەتای مێژووەوە هەتا دنیاش دنیایە لە گۆشەنیگای ئابووری و هۆیەکانی بەرهەم هێنان ( وسائل الأنتاج) ەوە هەڵسەنگێنێو مرۆڤ بە تاک و کۆمەڵییەوەو بە ئایین و فەلسەفەو ئەدەب و هونەرو، بە کولک و پێستییەوە لە هەگبەی ( گەدە ) ی دا بحەجمێنێو بێجگە لە بەشەڕهاتن لەسەر پاڕووی نان و پارەی گیرفان ، بۆ لێکدانەوەی ڕووداوو کارەساتەکان دان بە هیچ هاندەرو بزوێنەرێکی دیکەدا نەیەنێ !!

جا ئێمە لێرەدا مەودای هەڵسەنگاندنو لەبێژینگ دان و سەرکوێزر لێ گرتنی ئەو بیردۆزانەمان نیە، بەڵام هەر بە کورتی دەڵێین :

بیروبۆچوون و تێڕوانینی هیچ کام لەو توێژەرەوانە لە ئەندازەیەک ڕاستی ( حق ) خاڵی نیە، بەڵام بێگومان

سەرلەبەریشیان هەڵەو پەڵەی زۆریان تێدایەو، هیچ کامیشیان کەڵکی ئەوە ناگرن بکرێنە تەرازوو و سەنگی مەحەک بۆ هەڵسەنگاندن و تەفسیرکردنی مێژووی مرۆڤایەتی، چونکە لەڕاستیدا مرۆڤ نە بریتییە لە ( تاک ) ی بەتەنێ، نە ( کۆمەڵگا ) ی ڕووت !

وە هیچ کام لە غەریزەی جینسی و غەریزەی دەستەڵاتڕانان و غەریزەی خواردن و خواردنەوەو .. هتد ناگونجێ بکرێنە تاقە دینەمۆو پاڵنەرو بزوێنەری مرۆڤ و، بنچینەی تەفسیرکردن و شیکردنەوەی مێژووی مرۆڤایەتی، چونکە مرۆڤ لە هەموو ئەو غەریزەو هاندەرانەو چەندەهای دیکەش پێکهاتوەو هەمووشیان لە ژیان و گوزەران و جموجۆڵ و چالاکییەکانیدا بەشدارن و خاوەن پشک و بەشن !

وە لەڕاستیدا ئەو خاوەن بیردۆزانە

لە بەرانبەر تەفسیرکردنی ژیــــان و گوزەران و مێژوو و بەسەرهاتی مرۆڤ دا ڕاست وەک هەڵوێستی ئەو کۆمەڵە کوێرەیە کە چووبوون بۆ زانین و پەی بردن بـــە چۆنیەتی ( فیل ) ێک و، ئنجا لەبـــەر ئەوەی هیچ کامیان لەبەر بێ چـــاوی توانای ناسین و پەی پێ بردنی تێـــرو تەواویان نەبوو، ناچاربوون پەنا بەرنە بەر هەستی دەست لێ کوتان ( حاســـة اللمس ) و سەرەنجام کە گەڕانـــەوەو، خەڵک لێیان پرسین : داخوا ( فیـــل ) چییەو چۆنە ؟!

لە وەڵامدا هەریەکەیان بەشێوەیـــەک پێناسەی ( فیل ) ی کرد، کە لەوانـــی دیکە جیا بوو و بەشێک لە راستـــی پێکابوو، بەڵام هیچیان نەیان توانـــی پێناسەیەکی ڕاست و تەواوی بکـــەن، چونکە ئەوەیان کە لمبۆزی فیلەکـــەی کەوتبۆ بەردەست گوتی: کاکە گیان !

فیل شتێکە وەک گۆچان ، بەڵام ئەوەیان کە لاقی فیلەکەی وەبەردەست هاتبوو ، گوتی کورە بابەگیان گۆچانی چی !
نەخێر وا نیە، بەڵکو فیل شتێکە وەک ئەستوندەک ( کۆڵەکە ) ، ئەوەشیان کە دەستی لە گوێ ی دابوو، بە پێکەنینەوە پێناسەی هەردووکیانی ڕەتکردەوەو .. ؛ گوتی: نەخێر ئێوە شتاقتان ( فیل ) تان نەناسیوە، بەڵکو فیل شتێکە وەک گەڵای پانوایەو .. وە هەروەها .
ئنجا ڕەنگە یەکێک لێرەدا بپرسێ :
دەی باشە مادام تۆ ئەو بیردۆزەو تێڕوانینانەت هەموو پێ هەڵەو ناتەواو بن سەبارەت بە تەفسیرکردنی مێژوو ئەدی تەفسیری تێرو تەواوو ڕاست و دروست چییەو چۆنە ؟!
لە وەڵامدا دەڵێم :
تەفسیری ڕاست و دروستی مێژوو و بەسەرهات و ڕووداوەکانی مرۆڤایەتی،

بریتیه له تەفسیری ئیسلامی بۆ مێـــژوو ( التفسير الأسلامي للتأريخ ) .

تەفسیری ئیسلامیش بۆ مێژوو دەگونجێ له دوو خاڵی سەرەکی‌دا بخرێتەروو :

یەکەم: تێکڕای غەریزەو پاڵنەرە ماددی و مەعنەوی یەکانی سروشتی ئینســـــان – نەک بەس یەکێکیان – بەشدارن لــــە جووڵاندن و وەگەڕخستنی مرۆڤ و پەیــدا – کردنی جموجۆڵ و چالاکی‌یە تاکـــی و کۆمەڵایەتی یەکانی دا .

دووەم: هەموو ڕووداوو کارەسات و دیاردە جۆراوجۆرەکانی ژیانی مرۆڤایەتـــــی بەگوێرەی ویستی خواو، بەپێی چەنـــد یاساو دەستوورێکی نەگۆڕ ( ثابـــت ) بەڕێوە دەچن و، هیچ شتێکی ژیانـــی ئینسان هەروا بە هەڕەمەکی‌و بگــــرەو لێ نێشەیی نایەتەدی و، خـــــودا فەرموودەنی: هەموو شتێک ئەندازەگیری کراوە، ( إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ) القمر/٤٩ .

وە بۆ هەموو شتێکیش هۆو بنەمایەکی تایبەتی هەیە ( وَآتَيْنَاهُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا ) الكهف / ٨٤ .

وە ئەو بەرنامەو پەیڕەوەی کە ژیان و گوزەرانی گەلانی پێشووی خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، ژیان و گوزەرانی ئێمەو دوای ئێمەش دەگرێتەوە، هێندەی سەری دەرزییە گۆڕانی بەسەردا نایەت، چونکە هەروەک چۆن مانگ و ڕۆژو باقی خڕۆکەو ئەستێرەکان هەتا خاوەنی سروشت و ماهیەتی خۆیان بن، ئەو یاساو دەستوورە گەردوونیو فیزیاییو کیمیاییيانەش کە بەسەریان دا حاکمن ناگۆڕێن، مرۆڤیش خاوەنی سروشت و ماهیەتێکی تایبەتییەو، هەتا لەسەر ئەو سروشت و کەسایەتییەش بێ، هەموو ئەو یاساو دەستوورە دەروونی و کۆمەڵایەتیيانەش کە تا ئێستا بەسەریدا فەرمانڕەوا بوون، هەر فەرمانڕەوا

دەبن و ناگۆڕێن ، خوای زاناش لەو بارەوە فەرموویەتی: ( سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِيْنَ خَلَوا مِنْ قَبلُ وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً ) الاحزاب / ٦٢ .

ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە کە لەبەر تیشکی چەند ئایەتێکی قورئانی قسەلەجێو بەپێزدا ، چەند یاسایەک دەست نیشان بکەین ، سەبارەت بە هۆو چۆنیەتی ویران بوون و ئاوەدان بوونەوەی سەرزەوی و ، خێروخۆشیو بەختەوەری و ژینتاڵیو کوێرەوەری مرۆڤایەتی :

# یەکەم

# هۆی ویرانی و ژینتاڵی

خوای زاناو وردبین لە گەلێک جێگای قورئانیدا هۆو بنەمایەکانی ویرانیی و زیان و تەنگ و تاڵی مرۆڤایەتی دەست نیشان کردوو ون ، کە ئەم دەقانە

چەند نموونەیەکن لەوبارەوە :

١- ( ظَهَرَ الفَسادُ في البَرِّ والبَحْرِ بِما كَسَبَتْ أَيْدِي النّاسِ .. ) الروم/ ٤١ .

واتە: ئاشووب و خراپە لە ئیشکانی و دەریادا بە ئاشکرا پەیدابوو بەهۆی کردەی - خراپی - دەستی خەڵکییەوە ..

لەم دەقە قورئانییەدا خوای بێ وێنە بەبێ پەردە ڕای گەیاندوە کە خراپەو تاوانەکانی خەڵکی مایەی تێکچوونی سەرزەوی و سەرهەڵدانی هەراو ئاشووب و ژینتاڵی و دەردەسەرییەن لەنێو مرۆڤایەتیدا .

٢- ( وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكاً .. ) طه/ ١٢٤ . واتە :

وە هەرکەسێک ڕوو لە بەرنامەی من وەربگێڕێ ئەوە دووچاری گوزەرانێکی تەنگ و تاڵ دەبێت ..

لەم دەقەشدا خوای قسەلەجێ بە ڕاشکاوی فەرموویەتی کە ژیان و

گوزەرانی سەخت و دژوارو پڕ ئێش و ژان و کوێرەوەری ئەنجام و بەرهەمی سروشتیی ڕوو لە خوا وەرگێڕان و لە ڕێ لادانی مرۆڤەکانە ..

چونکە ڕێبازو بەرنامەی خوا بۆ مرۆڤایەتی وەک خەتی شەمەندەفەر ( قطار ) وایەو، بێگومان هەرکاتێکیش شەمەندەفەر لەسەر هێڵی ئاسن تەلاسابوو و لای دا توانای ڕۆیشتنی نامێنێ و پەکی دەکەوێ .

٣- ( وَإِذا أَرَدْنا أَنْ نُهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنا مُتْرَفِيْها فَفَسَقُوا فِيْها فَحَقَّ عَلَيْها الْقَوْلُ فَدَمَّرْناها تَدْمِيْراً ) الاسراء /١٦ .

واتە: وە هەرکاتێک ویستمان ئاوەدانی - یەک بفەوتێنین ، فەرمان بە خۆشگوزەرانەکانی دەکەین - کە چاکە بکەن - ئەوانیش خراپەی تێدادەکەن و ، سەرەنجام قسەو یاسای - خوای - بەسەردا دەچەسپێ و بەتەواوی کاولی دەکەین .

لەم دەقەش‌دا بەهەمان شێوە ئەو ڕاستی‌یە دووپات‌کراوەتەوە کە وێران بوون و وەزع تێکچوونی شارو دێ یەکان بەرهەمی شوومی لەرێ لادان و خراپەو تاوانی خەڵکەکەیە، بەڵام لێرەدا بەس ڕۆڵی چینی دەستەڵاتدارو سەرمایەدارو خۆشگوزەرانە سەرسەختەکان لەبەرچاو گیراوە، چونکە لە ڕوانگەی قورئانەوە ئەو توێژە پیسە ئاگری بن کایەن و ماکی زۆربەی هەرەزۆری دەردو گیروگرفتەکانی کۆمەڵن .

وە شایانی باسە کە چینی ناوبراو لە زۆر جێگای قورئانێ‌دا بە گەورەترین کۆسپ و لەمپەری سەر ڕێگای پێغەمبەران علیهم السلام و پیس‌ترین دوژمنیان لەقەڵەم دراون ، وەک خوای میهرەبان و زەبروەشێن فەرموویەتی :( وما أَرْسَلْنا في قَرْيَةٍ مِنْ نَذيرٍ إلّا قالَ مُتْرَفُوها إنّا بِما أُرْسِلْتُمْ بِهِ كافِرُونَ ) السبا/ ٣٤ .

واته: وه هیچ وریاکەرەوەیەکمان لە هیچ ئاوەدانییەک دا ڕەوانە نەکردوە مەگەر خۆشگوزەرانەکانی گوتوویانە: ئێمە سەبارەت بەوەی کە پێی ڕەوانە کراون کافرین..

٤- (وَاتَّقُوا فِتْنَةً لاتُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْكُمْ خاصَّةً..) الانفال / ٢٥. واته: وه خۆتان لە بەڵاو سزایەک بپارێزن کە بەس تووشی زۆردارەکانتان نابێ..

لەم دەقەش دا خوای بەرزو بێ هاوتا بێ پێچوپەنا خستوویەتەڕوو کە لە ئەنجامی ستەمو زەبروزەنگ و خراپەکاری دەستەیەک دا بەڵاو گیروگرفت و پەشێوی سەرلەبەری خەڵکی دەگرێتەوەو، هەموویان گیرۆدەی ئازارو سزاو جەزرەبە دەبن.

٥- (وما أصابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِما كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ..) الشورى / ٣٠. واته: وه هەر بەڵایەکتان تووش دەبێ ئەوە بەرهەمی دەستی خۆتانە..

بەڵێ هەروەک چۆن ماڵات کە گیای (ڕەنج) ی خوارد کە جۆرە گیایەکی ژەهراوی یە، یان پێی دەریخێنێ یان دەیتەقێنێ، هەر گەل و کۆمەڵێکیش لە پاوان و قەدەغەی تاوان و خراپەو بێ شەرعی‌یەکان دا دووچاری (زەر) ێ بوو، حەتمەن حەتمەن ئەگەر نەشبێتە هۆی لەنێوچوون و تەقینیشی لانی کەم زگ چوون و ڕیخاندنێکی تووش دەبێ.

ئێستاش کە هەتا ڕاددەیەک زانیمان هۆی ماڵ کاولی‌و کوێرەوەری و زینتاڵی چی یە! با بچینە سەر توێژینەوەی هۆی ئاوەدانی‌و خێروخۆشی‌و هێمنی‌و ئاسایش و بەختەوەری:

# دووەم

# لەوی ئاوەدانی و خێر و خۆشی

ئەم مەسەلەیەش دیسان لە چەندان شوێنی قورئانیدا قسەی لێکراوە بەڵام لێرەدا مەودای زۆرپێوەچوونمان نیەو، هەروا بەکورتی لە چەند خاڵێکدا، چەند دەقێکی قورئان بە نموونە دێنینەوە:

١- ( وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَىٰ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَرَكَاتٍ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ .. ) الاعراف / ٩٦ . واتە:
وە ئەگەر هاتبا و خەڵکی ئاوەدانیەکان بڕوایان هێنابا و پارێزیان کردبا، ئەوە لە ئاسمان و زەوی یەوە پیت و پێزمان بەسەردا دەڕشتن ..

وەک دەبینین خوای بەخشەرو بەبەزەیی ( بڕوا و پارێزکاری ) کردوون بە مایەی دەرووی خێر لێکرانەوەو پیت وپێزو

نازو نیعمەت و خێروخۆشی ..

٢- ( .. فَمَنِ اتَّبَعَ هُدايَ فَلا يَضِلُّ وَلا يَشْقَى ) طه / ١٢٣ . واتە :

.. جا هەرکەسێک وەدوای ڕێڕوونی من بکەوێ ، ئەوە نە ڕێ ی لێ تێک دەچێ و نە تووشی دەردەسەری دەبێ .

.. بەلێ شوێن کەوتنی بەرنامەو پەیڕەوی خوا ، یانی دۆستایەتی خوا کردن و لەگەڵ سروشتی خۆو سروشتی بوونەوەر ڕێک کەوتن و ئاشتی بەرپاکردن ، جا بێگومان هەر ئینسانێک و هەر گەل و کۆمەڵێکیش لەگەڵ خوا و خۆی و خەلک و دەوروبەری دا ڕێک وپێک و هاودەنگ بێ ، دیارە سەرلێ تێک چوون و مەینەتی و بەدبەختی ڕێ ی تێ نابەن و پەی پێ نابەن .

٣- ( مَنْ عَمِلَ صالِحاً مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَياةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ ما كانُوا يَعْمَلُونَ ) النحل /٩٧ .

واته: هەرکەسێک کردەوەی چاک بکات لە نێرو مێ وە بڕواداریش بێ، ئەوە بە ژیانێکی خۆش دەی ژیەنین، وە بەگوێرەی چاکترین کردەوەشیان پاداشتیان دەدەینەوە.

لێرەش دا دەبینین ژیانی خۆش (حَیاةً طَیِّبَةً) کە یەکێ بار مەعناو مەبەستی جۆرا وجۆری ماددی و مەعنەوی هەڵدەگرێ، کراوەتە بەرهەمو دەستکەوتی بڕواو کردەوەی چاک، وێڕای چاکترین پاداشتی دوا ڕۆژ.

جا خوێنەری سەنگین و شیرین!

ئێستا کەم تا کورتێک هۆو بنەمایەکانی (وێران بوون و ئاوەدانی) لەلایەکەوەو (ژینتاڵی و خێروخۆشی)یشما لەلایەکی دیکەوە زانین و، بەپێویستی دەزانم یەکسەر بچینە سەر ئەسڵی مەبەست بەڵام هەروەک چۆن (پاڵە)ی[1] چاک

---

(١) پاڵە: یانی بابای دروێنەکەر

حەزدەکات پەرێزی خاوێن بێو، پێی ناخۆشە داوەڵان[1] بکات، منیش چارەی داوەڵانم ناوێ، بۆیە وای بەچاک دەزانم بەرلەوەی ئەم (ڕێ خۆشکردن) ە بەجێ بێڵین، ملی داوەڵی پرسیارێکی سەرەتاتکەکەر بە داسی وەڵامێکی تیژو تازە سوواو هەڵببڕین، پرسیارەکەش ئەمەیە:

باشە ئەگەر ڕاستە ئاوەدانی و خێرو خۆشی بەرهەمو ئەنجامی بڕواو پارێزکاری و بەڕێوەچوونن بەپێی بەرنامەو پەیڕەوی خوا، وە بەپێچەوانەوە وێرانکاری و ژینتاڵی قەلەفسەی بڕکە گوزاڵکی بێ بڕوایی دوور لە خوایین، ئەدی بۆچی واقیعی ژیانی ئاوەدان و پڕ خێرو خۆشیو بەختەوەری دەوڵەت و کۆمەڵگا نائیسلامییەکانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا

---

(1) داوەڵ بەو گوڵە گەنمانە دەڵێن کە پاش دروێنەکردن بەپێوە لە پەرێزێ دا دەمێننەوە.

لەلایەکەوەو، واقیعی ژیانی پڕ گـــرێ و گۆڵ و دەردەسەری وڵاتە مسوڵمانەکانـــی جیهانی سێیەم لەلایەکی دیکەوە، ڕاستـ لەگەڵ ئەم بیروبۆچوون و تێڕوانینـــەدا پێچەوانەو بەراوەژوون ؟!
لەوەڵامدا دەڵێین :

لەبەرئەوەی ئەم پرسیارەمان لـــە کتێبی ( سۆزی نەتەوایەتی ) یـــش دا وەڵام داوەتەوە، خاوەنی پرسیار حەواڵەی وێ(١) دەکەین و، هیواداریـن ئـــەوەی لەوێ نووسراوە بابی وەڵامدانـــەوەو گرێ کردنەوەی دڵی بکات.

ئێستاش ئەتۆو هۆیەکانی وێران بوونی کوردستان و ژینتاڵیو دەربــــەدەری و بێ حاڵیی و کوێرەوەری گەلی کــــوردی کەساس و بێ کەس.

---

(١) بڕوانە لاپەڕە (١١٥) چاپی یەکەم .

## خاڵی یەکەم
## گەورەترین هۆی وێران بوونی کوردستان:
## حیزبی بەعسی کافرو زۆردارو درندە

خوێنەری بەڕێز !

دوای ئەوەی بە پیلانی ئیمپریالیزمی جیهانخۆری سەرچاوەگرتوو لە سەهیۆنیزم و خاچپەرست و کۆمۆنیزمی جیهانی یەوە ، کۆتایی بە خەلافەتی ئیسلامی هێنراو ، نیشتمانی پان و پۆڕی ئیسلامی بەپێی نەخشەو سیاسەتی گڵاوی ( پەرتکەو زاڵبە ) کوت کوت کراو ، بۆ چەند وڵاتێکی لێک پچڕاو دابەش کرا ، داگیرکەران و ملهوڕانی دژ بە ئیسلام بە مەبەستی ئەوەی کە جیهانی ئیسلامی هەر لەژێر ڕکێف و چاودێری خۆیان دا بمێنێتەوە

ئەگەر بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ( غیر مباشر ) یش بێ !! لە هەرکام لەو پارچانەی وڵاتی ئیسلامیدا کە ناویان لێ نابوون ( دەوڵەت ) نۆکەرو کوێخایەکی چڵکاوخۆری وابەستە بە خۆیا ڕۆنا ، کە بە موو لە نەخشەو بەرنامەو ڕێڕوونییەکانی وان لانەدات !!

جا بە بۆچوونی بەندە دڵسۆزترین و بەوەفاترینی ئەو نۆکەرو گزیرە کاسە لێسانە ( جَمال عَبْدُالنّاصِر ) ی میسری و ( حافِظْ أَسَدْ ) ی سووری و ( صَدّام حُسَیْن ) ی تکریتیو (شای ئێرا )ی گۆڕبەگۆڕ بوون ، چونکە ئەم چوار کەسە لە هەموو کوێخاو دابەستەکانی دیکە پتر زیانیان لە مسوڵمانا داوە، هەوڵی بنەبڕکردنی ئیسلامیان داوە .

بێگومان ئەمەش گەورەترین ئامانج و مەبەستی ئیمپریالیزمی جیهانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە .

وە پیس‌ترین و زیانبەخش‌ترین حیزبی کافرو عیلمانی کە بە پیلان و دەسیسەی ئیمپریالیزم وەک خۆرکەو سەرەطانێک لە جەستەی جیهانی ئیسلامی‌دا دروست‌کرا ، حیزبی بەعسی عارەبی سۆشیالیستە ، چونکە ئەو حیزبە کافرو درندەیە ، لە نیشتمانی ئیسلامی دا بەگشتی‌و لە عێراق و سووریادا بە تایبەتی‌و ، لە کوردستانی سەر بە عێراق دا بە تایبەتی تر ، لە ڕێی زیان گەیاندن بە مسولمانان و دژایەتی کردنی ئیسلامەوە ، گەورەترین خزمەتی بە ئیمپریالیزم کردووەو دەکات .

بەڵێ ئێمەی مسوڵمان دەبێ هێندە ژیرو وریا بین ، کە بەس ڕواڵەت و دیوی دەرەوەی شتان نەبینن و ، بە سەرکێڵی دەشتی نەفکرین و ، وانەزانین کە ڕژێمی بەعسی عەفلەقی کافر ئەوەی کە بەسەر خەڵکی عێراق و سووریا

بەگشتیو کوردستانی سەر بە عێراقی بەتایبەتی هێناوە، بەس زادەو هەڵقوڵاوی بیری پیس و نەگریسی خۆی بووە! بەڵکو ئەوە دەستی چەپەڵ و شوومی ڕووسیاو ئەمریکاو باقی وڵاتە ئیمپریالیستەکان بوو کە لە قۆڵی فش وفۆڵی بەعسی یە ڕەگەزپەرستەکانەوە هاتەدەرێو نەخشەو پیلانی گڵاوی وان بوو کە بەدەستی شاگردو کرێ گرتەو بەوەفایان، حیزبی بەعسی ڕەگەزپەرست و شۆفێنی لە نیشتمانی ئیسلامیدا بەگشتیو لەنێو نەتەوەی کوردی مسوڵمان دا بەتایبەتی جێ بەجێ کرا.

بەڵێ خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست!

لەڕاستیدا سەرەکی ترین و گەورەترین هۆی وێران کرانی کوردستان و، دەربەدەری و کوێرەوەری گەلی کوردی[1]

---

(١) بێگومان لە بەشە کوردستانەکانی

مسولمان لەم سەردەمەدا حیزبی بەعسی عارەبی سۆشیالیستە، کە هەتا ئێستا نەمزانیوە حیزبی هێندە خوانەناس و بێ ویژدان و زۆردارو درندە هاتبێتە دنیاوە! (مەگەر نازی یەکان و فاشی‌یەکان و ناصری یەکان، بەلام بەس لە هەندێک ڕووەوە).

بەلێ حیزبی بەعسی عەفلەقی فرچک دراو بە شیری گوانی ئیمپریالیزمی جیهانخۆری ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا، ئەوە هیچ کە هیچ دینێکی نیەو پابەندی هیچ جۆرە ڕەوشت و ئاکاریکی خوایی یانە نیە، بەلام سەربارى هەموو خەمان تەنانەت وەک جوولەکەش نیە کە لانی‌کەم

---

دیکەش دا جاروبار هەلویستی بەعسی‌یانە بەرانبەر بە گەلی کورد دەنوێنرێ، بەلام مالم هەقە هیچیان تۆزی ڕێ ی بەعسی‌یان ناشکێنن و دەسکانیشیان لەدوا ناکەن.

پابەندی یاساو دەستوورو عورفێکی سیاسی نێو دەوڵەتانیش بێت .

ئەو ڕەفتارو هەڵوێستە دڕندانەو کافرانەو ناقۆڵایانەش کە حیزبی بەعس سنووری هەموو جۆرە ئایین و یاساو دەستوورو عورفێکی پێ شکاندوون و هەموو نێوانێکی پێ بەزاندوون یەکجار زۆرن ، بەڵام بەس بۆ نموونە هەندێکیان کە زۆر زەقن دەخەینەڕوو :

یەکەم: ڕاگواستن و کاول کردن و کوێر کردنەوەی پتر لە (٥٠٠٠) شارو شارۆچکەو دێ لە سەرتاسەری بەشە کوردستانی سەر بە عێراقدا، کە هەڵەبجەو پێنجوێنو قەڵادزەو چۆمان و چوارتاو سەنگەسەر چەند شارێکن لەو شوێنانە .

دووەم: کیمیا ڕشێن کردنی هەڵەبجەو ناوچەکانی دەوروپشتیو ناوچەی بادینان و خۆشناوەتیو قەرەداغ و گەرمیان و .. هتد کە بوو بەهۆی

تێداچوونی چەندان هەزار کەس لە پیرو ژن و منداڵ و خەڵکی بێ چەک و بێ زەر.
سێیەم: بێ سەروشوێن کردنی هەزاران پیاوی خاوەن ژن و ماڵ بەتایبەتی لە خەڵکی بادینان و، پەراگەندەو بێ مشوورخۆرو چاوسوور مانەوەی هەزاران ژن و منداڵی بێ کەس !!
چوارەم: بەزۆر ئەتک کردن و دەست درێژی (تعدی) کردنە سەر سەدان ئافرەتی بەدیل گیراوی بێ کەس !! (تەنانەت ئافرەتێک کە نازانم چۆن گیانی خۆی دەرباز کردبوو، گوتبووی جاری وایە رۆژی بە چەند کەسێک دەچنە لای ئافرەتێک و بە زۆرەملێ ئەعمالی ناموسی لێ دەکەن) !!
پێنجەم: گرتن و لەسێدارەدان و ئەشکەنجەدانی هەزاران کوردی ستەمدیدە لە ژن و پیاوو کوڕو کچو پیرو گەنج .
شەشەم: داخستنی حوجرەو قوتابخانە

ئاینییەکان و کوشتن و گرتن و
دەرکردن و جەزرەبەدانی دەیان زانا و
پێشەوای شۆڕشگێڕو بڕوا دامەزراو، کە
ئامادەنەبوو ون خۆیان بفرۆشن ببنە
وابەستەو دابەستەی ڕژێمی بەعسی
کافرو دڕندە!
حەوتەم: پێشگیری کردن لە چاپکردن و
هێنان (استیراد) و بڵاوبوونەوەی
کتێب و گۆڤارو هەر بەرهەمێکی دیکەی
ئیسلامی ڕەسەن و، لە بەرانبەریش دا
ڕەواجپێدانی کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامەو
فیلمو .. هتد بۆ بڵاوکردنەوەی
خراپەکاری و بێ دینیو ڕەوشت نزمی و
بیری دژی ئیسلامی.
هەشتەم: هاندان و یارمەتیدانی ئەو زڕە
شێخو مەلا دین فرۆشانەی کە بە شێوەیەکی
هەڵەو خواروخێچ ئیسلام لە خەڵکی
دەگەیەنن و، بە بڕوای من دەوری وانیش
چی وا کەمتر نیە لە دەوری بەعس لە

شێواندن و لەبەرچاو بێزاندنی ئیسلام و،
پەرەپێدانی شەپۆلی دژی ئیسلام بوون و،
ڕەوینەوەو پرینگانەوە لە ئاییـــــن و
خواپەرستی !
نۆیەم: پەرەپێدانی دیاردەی جاشەتـــی و
خیانەت و سیخوڕی، کە پیس ترینــــن
نەخۆشییە بۆ گەلی کوردو، لە هەمــوو
شتێک پتر زیانی دنیاو قیامەتی خەڵکی
دنیاپەرست و فریودراوو لەخشتەبـراوی
بەناو مسوڵمانی تێدایە .
جا خوێنەری بەڕێز !
وەڵڵاهی ئەگەر بمەوێ نەک هەرچــــی
کە بەعسی کافر بە خەڵکی عێراق بەگشتی و
گەلی کورد بەتایبەتی کردوە، بەڵکــو
بەس زەکاتێکی بنووسم دەبێ لانی کــەم
مانگێک خەریکی سەرچاوەکۆکردنــــەوەو
نووسین بم و، بەلای کەمەوە چەند ســەد
لاپەڕەیەک ڕەش بکەمەوە !!
ئنجا ئەوکاتیش هەر ناتوانم ئەوەی

له دڵمدایه سەبارەت بە ستەمو زۆرو بێ ڕەحمیو دڕندایەتی حیزبی بەعس تۆماری بکەمو وەک پێویست تەعبیری لێ بدەمەوە ، چونکە بەدەردی فارس دەڵێ

" شنیدن کی بود مانند دیدن ؟! "

کەواتە با بەناچاری واز لەم باسە بڕین کولێنەوەیە بێنمو، (١) بچمەسەر خاڵی دووەمی مەسەلەی (هۆی وێران بوونی کوردستان چییە ؟! ) .



---

(١) شایانی باسە کە هەم لە نامیلکەی ( مەسەلەی کورد چییەو چۆن و بەچی چارەسەر دەکرێ ؟! ) وە هەم لە کتێبی ( سۆزی نەتەوایەتی ) دا پێناسەی حیزبی بەعسمان کردوە .

# خاڵی دووەم

# بۆخۆشمان بێ خەتانین !!

بەڵێ خوێنەری خۆشەویست !

هەرچەندە وەک لە خاڵی یەکەمدا گوتم گەورەترین و سەرەکی ترین هۆی وێران بوونی کوردستان و زینتاڵی گەلی کورد حیزبی بەعسی کافرو دڕندەیەو،(1) ئەو حیزبە کافرو خوانەناس و بێ ویژدانە ئاگری بن کای ماڵ وێرانی گەلی کوردە، بەڵام دەبێ دانیش بەوەدا بێنین کە بۆخۆشمان لەوبارەوە هەڵەو خەتامان

---

(1) دووپاتی دەکەینەوە کە دانیشتووانی بەشە کوردستانەکانی دیکەش کەموزۆر ڕەفتاری نائیسلامییانەو بەعسییانەیان لەگەڵ دا دەکرێ ، دیارە ئێمەش دژی ڕەفتارو هەڵویستی دڕندانەو نادادگەرانەین لە هەرکوێ یەک بێ و لەژێر هەر پەردەیەک دا بێ، چونکە خراپە هەر خراپەیەو ستەم هەر ستەمە .

هەیەو، نابێ لە هەڵەو پەڵەی خۆشمان بێ ئاگا بین.
جا ئەوە لەم خاڵی دووەمەدا بەوردی بەخۆمان دا دەچمەوەو هەوڵ دەدەم بەبێ لایەنانەو بەبێ پێچوپەناو بێ گوێ دانە ڕەخنەو گلەییو گازندەی ئەملاولاش دەست لەسەر سەرچاوەی دەردی خۆشمان دانێم، چونکە بەبێ دیاری کردنی جۆرو چۆنیەتی شوێنی نەخۆشی مەحاڵە بتوانرێ دەرمانو چارەسەری بۆ دابنرێ و ئەگەر گریمان دا شبنرێ بێ سوودەو جێی خۆی ناگرێ!
جا هەرچەندە هەڵەو خەتایەکانی ئێمە زۆرو جۆراوجۆرن بەڵام هەموویان وەک لقو پۆپی درەختێک دەگەڕێنەوە سەر یەک بنک و ئەسڵ ئەویش بریتیە لە:

# لەئیسلام بێ ئاگایی

بەڵێ لە ئیسلام بێ ئاگایی گەلی کورد گەورەترین و بنەڕەتی ترین دەوری هەبووەو هەیە لە بەجێماوی و فەوتاویو ماف شێلراوی ی دا ، چونکە هەرچەندە حیزبی بەعسی کافرو زۆردارو باقی ناحەزو دوژمنەکانی دیکەی کوردیش دڕندەو بێ ویژدانیش بن ، ئەگەر ئێمە بۆخۆمان هەبین و نەخۆش نەبین ، ناتوانن زەفەرمان پێ بەرن و کورد گوتەنی (دار کرمی لەخۆی نەبێ قەت ناڕزێ ) !!

لێرەدا حەزدەکەم قسەیەکی زۆر نەستەق و بەجێی زانایەکی مسوڵمانی جەزائیری بێنمەوە کە دەربارەی چەوسێنرانەوەو بێ قەوارەیی گەلەکان فەرموویەتی ، دەڵێت :

( هیچ گەلێک ناچەوسێنرێتەوەو باری

زوڵم و ستەمی ناخرێتە سەرشان هەتا بۆخۆی شایستەیی چەوسێنرانەوە " قابلیة الأستعمار " لەخۆی دا نەیەنێتەدی )!! (1)

ئاخر چۆن دەگونجێ گەلی کورد سەبارەت بە دەردی چەوساوەیی خۆی، خۆی بەبێ خەتا بزانێ! ئایا ئەو شەڕکەرەی کە لە جەنگەی جەنگ دا قایمترین و ستراتیژی ترین سەنگەری خۆی چۆڵ دەکات و، پاشان تێ دەشکێ یان دەپێکرێ، دەگونجێ بڵێ تێشکان و پێکرانم هیچ سووچ و تاوانی خۆمی تێدا نەبووە ؟!!

دەجا ئیسلامیش مەحکەمترین و گەورەترین سەنگەری گەلی کوردو هەموو گەلێکی دیکەی مسوڵمانی چەوساوەشە لەئاقار هێرشی دڕندانەو داگیرکەرانەی

---

(1) ئەو زانا بەڕێزە ( مالک بن نبی ) جەزائیری خوالێخۆش بوویە .

دوژمنان دا ، گومانیشی تێدا نیە کە ماوەیەکی زۆرە گەلی کوردو زۆربەی هەرە زۆری گەلانی دیکەی جیهانی ئیسلامیش سەنگەری ئیسلامیان چۆڵ کردوەو، بەم کارەش چاکترین دەرفەتی زاڵبوونیان بۆ دوژمن ڕەخساندوەو، پتەوترین و باشترین قەڵای بەرگری کردن و ڕێسمانی دەست تێ گرتنیشیان لەدەستداوە !

ئنجا مەسەلەی لە ئیسلام بێ ئاگایی گەلی کوردو زۆربەی گەلانی دیکەی جیهانی ئیسلامیش شتێکی هێندە ڕوون و بەرچاوە، پێم وانیە دمبەدمەو مشت ومڕی هەڵبگرێ ، بەڵام ئەوەی کە حەوجێی ڕوونکردنەوەو سەلماندنە، ئەوەیە کە : ( ئایا چۆن لە ئیسلام بێ ئاگایی گەلی کورد بنەڕەتی ترین هۆی ماڵ وێرانیو بەشخوراویو بێ قەوارەیی یەتی ؟! )

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەش و سەلماندنی ئەو مەسەلەیەش سەرنجی

خوێنەر بۆ دوو بەڵگان ڕادەکێشم :
یەکەم: هەرکەسێک نەختێک سەرەدەری لە قورئان و سوننەتدا بکات و بڕێک بە یاسا هەمەلایەنەو جۆراوجۆرەکانی ئیسلام ئاشنا بێت، دەزانێ کە ئیسلام بەرنامەو پەیڕەوێکی وایە، عیبادەت و سیاسەت و دنیاو قیامەت و مزگەوت و بازاڕو تەقواو تەقەو عەقڵ و دڵ و .. هتد پێکەوە گرێ دەدات و بۆ هەموو پرسیارێک چاکترین وەڵام و بۆ هەموو دەرگایەک باشترین کلیلەی هەیەو، لەبەردەم چارەسەری هیچ گیروگرفتێک و کردنەوەی هیچ گرێ یەکدا دانامێنێ و، هەموو دەمێ لە هەر بارودۆخ و سەردەمێکدا دەتوانێ ساغ و سەلیمترین کۆمەڵگاو تێروتەواوترین دەولەت و بەهێزترین سوپا بخەملێنێ و، سەر بە گەورەترین طاغووت و دیکتاتۆری ڕۆژگار دانەوێنێ!
دووەم: بەدرێژایی مێژووی (١٤٠٠) ساڵەیی

ئیسلام دەیان گەل و تیرەی جۆراوجۆری وەک : عارەب ، تورک ، فارس ، ئەییوبی ـ یەکان ، غەزنەوییەکان ، سەلجووقی ـ یەکان ، بوەیهییەکان ، فاطمییەکان ... هتد ، هەرکاتێک بەڕاستی دەستیان دەرێسمانی ئیسلام گرتبێ‌و پەنایان بوو بەرنامە خواییەیە بردبێ ـ وێڕای کەم و کووڕیشیان ـ نەک هەر بەرەی خۆیان پێ لە ئاوێ دەرێناوەو، خۆیان پێ حەساندۆتەوە، بگرە پێی بوونە سەرقافلەش و خەڵکیشیان لەبن باڵی خۆیان دا حەواندۆتەوەو، ناحەزو دوژمنیشیان لەبن پێیان دا پلیشاندۆتەوە !!

کەواتە :

ڕاستە بێ ئاگایی گەلی کوردمان لە ئیسلامێکی ئاوا، بنچینەو چاوگی ماڵ وێرانیو ڕۆژ ڕەشی بووە !

ئنجا ئەوەی کە قورەکەی بۆ گەلی کورد خەستتر کردو کارەکەی خراپتر کرد، ئەوەبوو کە پاش لە ئیسلام[1] بێ ئاگابوونیو چەواشەبوونی، وەک ئەنجامێکی سروشتی ی لەئیسلام دوورکەوتنەوە، گەلی کورد دووچاری دەردی کوشندەی:

## ڕوو لە بێ دینی کردن

بوو، لەسۆنگەی ڕوو لە بێ دینی کردنیشەوە، گەلەکەمان تووشی دوو

---

(۱) بۆئەوەی هیچ کەس بەهەڵە لە قسەکانمان حاڵی نەبێ، یان بەهانەی خۆلابازدان و خۆگێل کردنی دەستگیر نەبێ، ڕای دەگەیەنم کە مەبەستم لە (لە ئیسلام بێ هەواڵیی کورد) نامسوڵمانەتیو لە ئیسلام دەرچوونی نیە، بەڵکو بەهەڵەداچوونیەتی لە ناسینی ئیسلامداو، کورت هەڵێنانیەتی لە جوغزێکی تەسک و گچکەدا.

نەخۆشی یەکجار پیس و کوشندەو درم بوو، کە زۆر لەمێژە گەلی کورد پێیانەوە دەبنێسیو بە ئێش و ژانیانەوە دەتلێتەوە ئەو دوو نەخۆشیەش ئەمانەن :
یەکەم: ( ڕوو لە ڕێچکان کردن )
دووەم: ( خۆ بە دوژمن فرۆشتن )
جا ئێستا با بێینە سەر نەخۆشی یەکەمو خستنەڕووی پەرێزی پیسی و سەرەنجامی شوومو بەدی .

## ١/ ڕوو لە ڕێچکان کردن

پەندێکی کوردی هەیە دەڵێت :
( ئینسان کە بە ڕووباری داچوو دەست بۆ پووشێش درێژ دەکات ) دیسان گوتراوە ( ڕووی ناچاری بە ڕەش بێ سەرت پێ بە ماڵێ نامەردیش دا دەکات ) !!
گەلی کوردی مسوڵمانیش دوای ئەوەی ئایینی ئیسلامی وەک بەرنامەو پەیڕەوێکی تێروتەواوو هەمەلایەنەی ژیا ن

لەنێودا نەماو لەبیریش چۆوە ، وە ..
لەولاشەوە لافاوی قوڕاوی دەستدرێژی
کرانەسەرو چەوساندنەوەو پێ شێل کران
هەڵی گرت ، بەناچاری جار لەدوای جار
دەستی بۆ چڵەپووشەکانی قەراغ شەوی
لافاوە قوڕاوە درێژکردو ، هەرجارە پەنا
بۆ یەکێک لە ڕێچکەو بیردۆزە
مرۆڤکردەکان برد ، بەڵام سەرەنجام
بێجگە لە خاکەساری و ماڵ وێرانی و
شپرزەیی زیاتر هیچی بەهیچ نەکردو ،
واشگێژ بووبوو هیچ جارێکیان پەندو
عیبرەتی لە چڵەپووشەکانی پێشەوە
وەرنەگرت !!
سەرجەمی ئەو ڕێچکەو بیردۆزانەش
کە گەلی کوردی هەموو بەشەکانی
کوردستان بەئومێدی دەفریاهاتن پەنای
پێ بردن ئەمانە بوون :
کۆمۆنیزم ( الشیوعیة ) ، لیبرالیزم ،
دیموکراتیەت ، مارکسیزم ، ماویزم ،

سۆسیالیزم، ناسیۆنالیزم.. وە کوفریزم(١)!

ئنجا دەردی کوشندەی ( ڕوو لە ڕێچکان کردن ) بوو بە زبڵدانێک کە گەراو میکرۆبی چەندان دەردی دیکەی بێپەزای تێدا ترووکان ، کە ئەمانە سەرەکییەکانیانن :

١- پەرتەوازەبوون ( التفرق ) :

خوای زاناو کاربەجێ فەرموویەتی :
( وأَنَّ هذا صِراطِي مُسْتَقِيْماً فاتَّبِعُوهُ ولاتَتَّبِعوا السُّبُلَ فَتفرقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيْلِهِ.. ) الأَنعام/ ١٥٣ . واتە :

وە ئەمە ڕاستە ڕێ ی منە پێیدا بڕۆن و وەدوای ڕێچکان مەکەون ، دەنا بە پەرتەوازەیی لە ڕێ ی خوا تەلاسادەبن..

بەڵێ بەهۆی وەدواکەوتنی ڕێچکەو بیردۆزەکانەوە گەلەکەمان چەند شەپرێوە هێندەی دیکەش شەپرێو بوو و ،

---

(١) مەبەستم لە کوفریزم ئەو ڕچەیەیە کە هەندێک کەس دەیگرنەبەرێ، تاقە ئامانجیان ئەوەیە کە خۆیان کافربکەن و دژایەتی ئیسلام بکەن، دەنا هیچ بیرێکیان نیە .

بوو بە چەندان پێڕو تاقمی جۆراوجۆری وێک هەڵنەکەرو دژ بەیەک و خۆخۆر !!

٢- بێ هێزوپێز بوون :

خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی :

(وَلاتَنازَعُوا فَتَفشَلُوا وَتَذهَبَ رِيحُكُم...) الأنفال / ٤٦ . واتە :

وە پێکەوە ناکۆک مەبن دەنا تێ دەشکێن و هێزتان نامێنێ ...

دیارە بێ هێزو پێز بوونیش بەرهەمی بێ سێو دووی پەرتەوازەیی یە .

٣- دوژمن پێ خۆش بوون :

بێگومان دوژمن خواخوایەتی بەرانبەرەکەی دەستەو پارچەپارچە بێو لەبەر دووبەرەکیو دوژمنایەتی نێو خۆیان ئاگایان لەوی نەمێنێ ، جا جێی داخە کە واقیعی حیزب و ڕێچکەکانی کوردستان ڕاست بەو شێوەیە بووەو ، نەک هەر ئەوەندە بگرە جاری واش بووە لایەنێک چۆتە باوەشی دوژمنیشەوەو، لە

پشتەوەڕا لە سەنگەری دوژمن دا لوولەی تفەنگەکەی خۆی ئاراستەی سینگی برای هاوزمانی کردوە، جا نازانم بێجگە لە دەماری کوێخایەتی کردن و کورسی خوازی چ هاندەرێکی دیکە ئەو ڕێچکانەی دووچاری ئەو جۆرە ڕەفتارو هەڵوێستانە کردوە !!

٤ـ خەڵک بەدبین بوون :

شتێکی بەڵگەنەویست و ئاشکرایە کە خەڵکێک واقیعی ئاوا لەنێو ئەو پێڕو تاقمانەدا ببینێ کە هەرکامێکیان خۆی بە خاوەن و دەمڕاست و مشوورخۆری گەلە هەناسە ساردەکەی دەزانێ، بێ سێ و دوو تووشی بەدگومانی و بەدبینی و بێ هیوایی دەبێ، چونکە خەڵکیای بە گوێ یان نەخواردوە و دەزانێ کە ئەو ماستە بێ موو نیەو چ عەلەم بێ قەڵەم نین !!

ئنجا ئەو بەدبینی و بێ هیوایی یەی

خەڵکیش دەورێکی گرنگی هەبووە لە پەرەستاندن و گەشەکردنی دیاردەی خۆ بەدوژمن فرۆشتن دا بە هەموو جۆرو شێوەکانی‌یەوە، چونکە تەسلیم‌بوون و خۆبەدەستەوەدان و چەک فڕێدان زۆر جاران ئەنجام‌و بەرهەمی بێ هیوایی‌و بڕواو متمانە نەمانە بە بایەخی جەنگ و بەرهەڵستی کردن !!

٥- مسوڵمان دوور بوون :

هەرچەندە گلەیی‌و گازندەم لە مسوڵمانان زۆرە بەڵام جارێ هیچ ناڵێم‌و دوایی لە خاڵێکی سەربەخۆدا جامی تووڕەیی خۆمیان بەسەردا دەڕێژم !

ئەمما گومانی تێدا نیە کە واقیع‌و ماهیەتی نائیسلامی‌یانەو بێ سەرەوبەرەی حیزب و ڕێچکان دەورێکی یەکجار گرنگ و کاریگەری هەبووە لە کەنارەگیری و دوورەپەرێز بوونی مسوڵمانان و بەشداری نەکردنیان ، یان ڕاستتر بڵێم بەشداری

نەکردنی بەشی هەرەزۆریان لە شۆڕش و
خەباتی ئازادیخوازی گەلی کورد دا .

٦- ڕەوشت لەدەست چوون :

دەستکەوتێکی دیکەی گرانبەهای !
دەردی وەدوای ڕێچکان کەوتن بۆ گەلی
کورد، بریتی بوو لە گەندەڵ بوون و ،
خوو و ڕەوشتی ئیسلامییانە لەدەست چوون
لەنێو زۆربەی خەڵکیدا بەگشتیو، لەنێو
ڕیزەکانی شۆڕش دا !! بەتایبەتی .

ئنجا وەک زانایانی کۆمەڵناسیش
دەڵێن : خوو و ڕەوشتە بەرزو پەسندەکان
بۆ پێکەوەبەستن و هێشتنەوەی کۆمەڵگا ،
وەک ژێ و دەمارو جومگەکانی لەشوان !
شاعیرێکی عارەبیش لەوبارەوە
گوتوویەتی :

وإنما الأمم الأخلاق إذا هم
أخلاقهم ذهبت ذهبوا

٧- وە سەرەنجام: خوا تووڕەبوون :

چونکە خوا لە هەر گەل و کۆمەڵێک

تووڕە دەبێ کە بێ فەرمانی بکات و، ڕوو لە ڕێچکان کردن و هەرکام لە بەرهەم و دەستکەوتەکانیشی ( پەرتەوازە بوون ، بێ هێزو پێز بوون ، دوژمن پێ خۆش بوون ، خەڵک بەدبین بوون ، مسولمان دووربوون ، وە ڕەوشت لەدەست چوون ) سەرلەبەریان تاوان و خراپەن و، مایەی تووڕەیی و قەهری خوداشن !

ئەمە بەکورتی حاڵ و بەسەرهاتی نەخۆشی ( ڕوو لە ڕێچکان کردن ) و پەرێزی پیسی و سەرەنجامی شووم و بەدی بوو، ئێستاش نۆرەی توێژینەوەی نەخۆشی دووەمە :

## ٢/ خۆبەدوژمن فرۆشتن

پەندێکی کوردی هەیە دەڵێ: ( کەری دێزە لە ڕقی ساحێبی خۆی لە شاخی هەڵدەدێرێ ) ، بەڕاستی ئەم پەندە پڕ بە پیستی واقیعی ئەو نەفام و

کێژانەیە کە بە بیانووی ( ناتەواوی ی شۆڕش ) یان ( گلەیی‌و ڕەخنە هەبوون لە واقیع‌و بەرنامەو دەمڕاستانی شۆڕش ) خۆیان بە دوژمنیان دەفرۆشن و لە دژی خواو لە بەرانبەر گەلی بێ کەس‌و چەوساوەیان دا سەنگەرێ دەگرن و ، لە پێناوی ئافەرین و زارچەورکردنێکی نامەردانەدا ، دوژمنی خواو پێغەمبەرو صلی اللە علیە وآلە وسلم گەلەکەیان بەهێز دەکەن و ، لەو ڕێ یەدا بە سەرشۆڕی‌و ڕووڕەشی‌و بێ بەشی‌و سەر بە هەشی‌و چارەڕەشی سەری خۆیان بە فەتارەت دەدەن و دەمرن .

هەڵبەتە خۆ بە دوژمن فرۆشتن و خیانەت بە خواو خەڵک کردنیش جۆرو شێوەی زۆرن ، بەڵام سێ یان لە هەمووان بەرچاوترن کە ئەمانەن :

١- جاشەتی

٢- سەربازی ٣- سیخوڕی ( التجسس )

جا بێگومان دیاردەی خۆبەدوژمن فرۆشتن ، هێندە دیاردەیەکی ترسناک و نەخۆشییەکی پیس و کوشندەیە ، هەتا لەسەری برۆی هەڵدەگرێ ، بەڵام من لەبەر چەند هۆیەک. لێرەدا زۆری لەسەر نادوێم ، یەکەم : چونکە دیاردەی ناوبراو هێندە شتێکی زەق و ناقۆڵایە ، تەنانەت منداڵ و پاڵیش بەچاوی سووک و گاڵتە پێکردنەوە بۆی دەڕوانن و ، حەوجێ بەوەی ناکات خۆمان بە بەرپەرچدانەوەو پەردە لەسەر هەڵماڵینییەوە ماندوو بکەین ، دووەم : قەبارەی ئەم نامیلکەیە مەودای ئەوەمان نادات ، سێیەم : هەم لە کتێبی ( سوزی نەتەوایەتی ) و هەم لە نامیلکەی ( مەسەلەی کورد ) دا چەند قسەیەکی هەق و زەق و ڕەق بەو خۆفرۆشە ئەحمەق و موستەهەقانە گوتراوە ، کە ئەگەر لە گوێ یان بگرن بەسیانە .

ئنجا خوێنەری بەڕێز !

لێرەشدا کۆتایی بەم خاڵی دووەمەش دێنین کە تەرخانمان کردبوو بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستییە کە ( بۆخۆشمان بێ خەتا نین ) چونکە پێم وایە هەر کەسێک قەناعەت هێنانی پێش بیرکردنەوی ڕێ ی لێ نەگرتبێ‌و، لەئاقار هەق و ڕاستیدا چاوان نەقووچێنێ، بێ سێ‌و دوو دانی پێدا دێنێ‌و دەیسەلمێنێ کە بەلێ ڕاستە بۆخۆشمان بێ خەتا نین و، ئێمەش ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە وێران کردنی کوردستان و دەربەدەری و کوێرەوەری گەلەکەمان دا بەشدارین، بەڵام بێگومان ئەو خەتاباری‌و بەشداری ـ یە لە کەسێکەوە بۆ کەسێک و لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێک جیاوازی زۆرە، پێشینانیش گوتوویانە : ( پەنجەی دەستانیش وەک یەک نین ) !!

ئێستاش دەچینە سەر خاڵی سێیەم کە

تەرخانمان کردوە بۆ توێژینەوەی ئەوە داخوا ( لە ئیسلام بێ ئاگایی گەلی کورد سووچی کێ یە ؟! ) !!

چونکە وەک لە لاپەڕەکانی ڕابردوودا دەرکەوت ( لە ئیسلام بێ ئاگایی) گەلی کورد ئەسڵ و بنەمای هەموو دەردو نەخۆشیو گیروگرفتەکانی بوو، کەواتە با سەرنج بدەین و بزانین داخوا کێ بوو بە مایەی نەزانیی و بێ ئاگایی ئەو گەلە مسوڵمانە سەبارەت بەو بەرنامەو پەیڕەوەی کە خۆی بە شوێن کەوتووی دەزانێ ؟!!



# خاڵی سێیەم
# لەئیسلام، بێ ئاگایی گەلی کورد سووچی کێیە؟!

بێگومانم کە لەسەدا نەوەد (٩٠%) ی خەڵکی لە وەڵامی ئەم پرسیارەی سەرێ دا بێ سێو دوو لێکردن دەڵێن : ( شتێکی ئاشکرایە کە سووچی زاناو پێشەوایانی ئایینە ) !

بەڵام من لەوبارەوە ڕایەکی دیکەم هەیەو پێم وایە کە پێنج (٥) لایەن لەوبارەوە بەرپرسیارن و، ئۆباڵی لە ئیسلام بێ ئاگایی گەلی کورد تەنیا لە ئەستۆی زاناو پێشەوایان دا نییە، هەرچەندە ئەوان گەورەترین پشکیان لەو بەرپرسیاری ( مسئولیة ) یەدا هەیەو، لە هەموو کەس زیاتر جێی ڕەخنەو گلەیین .

ئەو پێنج لایەنەش کە ئۆباڵی لە

ئیسلام بێ ئاگابوونی گەلی کوردیان لە ئەستۆ دایە، ئەمانەن :

١- خودی خەڵکەکە بە تێکڕایی
٢- زانا و پێشەوایەکان
٣- ڕۆشنبیرە ئیسلامی‌یەکان
٤- حیزب و ڕێچکەکان
٥- ڕژێمە طاغووتی‌یەکان

ئێستاش چۆنیەتی بەرپرسیاری و دەست تێدا هەبوونی هەرکام لەم پێنج لایەنە سەبارەت بە بێ ئاگایی گەلی کوردی مسوڵمان لە ئیسلام، لە چەند دێڕێک دا دەخەینەڕوو و دەشسەلمێنین :

یەکەم: خەڵکی کورد بەتێکڕایی

بەرپرسیاری ی تێکڕای خەڵکی کورد لەو ڕووەوەیە کە ئیسلام وەک ئایینی شێوێنراوی مەسیحی نیە، کە بڕوای بەوە هەبێ کە دەبێ بەس کەسانێکی دیاریکراو بەناوی پیاوانی ئایین ( رجال الدین ) مشووری لێ بخۆن و سەرپەرشتی بکەن !

بەڵکو لە ڕوانگەی ئیسلامەوە تێکڕای خەڵکی بە ژن و پیاوو پیرو گەنج و دەوڵەمەندو هەژارو فەرمانڕەواو فەرمانبەرو .. هتدەوە بەشوێنکەوتوو و مشوورخۆرو لێپرسراوی کاروباری ئایینو بەرنامەی خوا لەقەڵەم دەدرێن ، چونکە ( ئیسلام ) بەرنامەو پەیڕەوی سەرلەبەری ژیانە بۆ تێکڕای خەڵکی وەک خودا فەرموویەتی :( إِنَّ الدِّيْنَ عِنْدَ اللَّهِ الإِسْلامُ ) آل عمران / ١٩ . واتە : بێگومان بەرنامە [١] ـ ی ژیان ـ لەلای خوا بەس ئیسلامە ...

وە لە هیچ دەقێکی قورئان و سوننەتدا بەڕێوەبردنی بەرنامەی خوا تایبەت

---

(١) لە نامیلکەی ( ئایین ) دا کە ئاڵقەی شەشەمی زنجیرەی ( با چاکتر ئیسلام بناسین ( ) ٥، بە تێروتەسەلی باسی ئایین کراوەو، لە چەند بەندێکدا دروشمو نیشانەکانی ئایینی خوا خراونەروو .

نەکراوە بە بەشێک یان چین و توێژێکی تایبەتی‌یەوە، بەڵکو لە سەرلەبەری قورئان و سونەتدا هەر بەگشتی و بە تێکڕایی ڕوو لە خەڵکی کراوە کە بە ئیسلام و یاسا و دەستوورەکانی‌یەوە پابەند بن، بۆ وێنە:

دەیان جار (یا أَيُّها الَّذِينَ آمَنُوا) وە چەندان جار (یا أَيُّها النَّاس، یا بنی آدم، یا أَيُّها الانسان) لە قورئانی‌دا دووبارە بوونەوە، بەڵام تاقە جارێکیش نەگوتراوە (یا أَيُّها العلماءُ) یان (یا أَيُّها الأمراءُ)!!

ئنجا پێغەمبەری پێشەواشمان صلی الله علیه وآله وسلم لە فەرموودەیەکی‌دا کە بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە فەرموویەتی: (كُلُّكُمْ راعٍ وكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ..) واتە:

هەرکامێکتان شوان و چاودێرن و، وە هەرکامێکتان لەبارەی خەڵکەکەیەوە بەرپرسیارە..!!

کەوابێ ؛

خەتاباروو تاوانباری یەکەم لە بێ ئاگایی‌و دووری خەڵکی کورد لە تێگەیشتنی ڕاستەقینە دەربارەی ئیسلام هەر خودی خەڵکەکەیە ، چونکە نەدەبوو خەڵکەکە سەبارەت بە ئایین و بەرنامەی خوا هێندە کەمتەرخەم‌و بێ مشوور بێ کە نەزانێ چی‌یەو چۆنەو بۆچی هاتووەو چی لێ داوا کردوون ؟!

ئنجا لە بەسەرهاتی ( موسی ) علیه السلام‌و ( سامری ) یش‌دا کە لە قورئانێ لە سوورەتی ( طه ) دا گێڕراوەتەوە ، پتەوترین بەڵگەی ئەم قسەیەی ئێمەی تێدایە ، چونکە دوای ئەوەی مووسا سەلامی خوای لێ بێ، ماوەی(٤٠) ڕۆژەکەی لەسەر کێوی ( طوور) لە خزمەت ڕازو نیازو گفت‌وگۆی خوادا بەسەربردو ، خوای میهرەبان هەواڵی پێدا ،کە گەلەکەت ( سامری ) سەری لێ تێک داون و گیرۆدەی

گۆلک پەرستی ( عِبادةُ العِجْـــل ) ی کردووە و، بە درۆو دەلەسان لەخشتەی بردوون ، مووسا بە پەلەو بە تووڕەیی گەڕایەوە، بەڵام بەرلەوەی هیچ شتێک بە ( سامری ) یان ( هاڕوون ) ی برای بڵێ کە جێگری بوو، ڕووی لە خەڵک و حەشاماتەکە کردو بە تووڕەیی‌یەوە پێی گوتن ( .. يا قَوْمِ أَلَمْ يَعِدْكُمْ رَبُّكُمْ وَعْداً حَسَناً أَفَطَالَ عَلَيْكُمُ الْعَهْدُ ؟! أَمْ أَرَدْتُمْ أَنْ يَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبٌ مِنْ رَبِّكُمْ ..؟!) /٨٦.

ئنجا دیسان هەر هیچی بە ( سامری) نەگوت هەتا سەرو ڕیشی هاڕوونی برای گرت بە تووڕەیی پێی گوت : ( يا هارونُ ما مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوا . أَلاَّ تَتَّبِعَنِ، أَفَعَصَيْتَ أَمْرِي ؟ ) / ٩٢، ٩٣ .

ئنجا پاشان لە قۆناغی سێیەمدا چوو سەروکاری سامری و دەستی کرد بە لێپرسینەوەی و سزا بۆدانانی (١)!

---

(١) بەسەرهاتی ( مووساو سامری ) لە

کەواتە :

ڕاستە لە ئیسلام بێ ئاگا بوون و دوورکەوتنەوەی گەلی کوردو هەر گەلێکی دیکەش ، لەپێش هەموو کەس دا سووچی خودی خەڵکەکەیە ، دەنا کۆمەڵێک بەڕاستیو بە گرنگی پێدانەوە دەست بە بەرنامەی خوا بگرن و پێیەوە پابەند بن ، دیارە زۆر بە سێنایی دەتوانن زۆر چاکی لێ حاڵی بن و ، بە هیچ کەسیش فریونەخۆن و لەخشتە ناچن !

بەڵام واقیعی گەلی کوردی مسوڵمان سەبارەت بە ئیسلامو پێوە پابەند بوونیو تێگەیشتنی ئەو پەندە کوردییەی بەسەردا دەچەسپێ کە دەڵێ :

" ماڵ هەر بۆخۆی نەبوو ، میوانان ڕوویان تێ کرد ، لەوەندیش بوو ! " .

---

قورئانێدا بەس لە سوورەتی ( طـه ) دا هاتووەو ، لە ئایەتی (٨٣) وە هەتا (٩٨) ی گرتووە .

ئێستاش با بچینە سەر لایەنی خەتاباری دووەم:

دووەم: زاناو پێشەوایەکان:

لەڕاستی‌دا ئێمە لەو ڕووەوە (تێکڕای خەڵک) ەکەمان لەبواری لە ئیسلام بێ ئاگابوونی کورد دا بە خەتاباری یەکەم دانا کە ئیسلام وەک ئایینە تێکدراوو شێوێنراوەکان نیە بەس بریتی بێ لە چەند مەسەلەو درووشمێکی مەعنەوی و شەخسی، کە تایبەت بێ بە کات و شوێن و کۆمەڵ و دەستە - یەکی دیاری کراوەوە، بەڵکو بەرنامەو ڕێبازی ژیان و گوزەرانی تێکڕای خەڵکیەو، هەموویان لەئاقاری دا بەرپرسیارن.

دەنا ئەگەر لەو ڕووەوە دوابایین داخوا کێ سووچو خەتای پترە لە سەر لێ شێواندن و لە ئیسلام بێ هەواڵ بوون و پەرتەوازە بوونی گەلی کورد دا،

ئەوە بە هەموو قەناعەتێکەوە دەڵێم دەبوو ( زاناو پێشەوایان ) مان لە سەرەتای لیستەی گۆرینەوە نووسیبان .

جا هەرچەندە دەزانم کە ئێستا خەڵکی بەگشتیو زانایان بەتایبەتی هێندەی شەش حەوت ساڵ پێش ئێستا کە باسی کەمتەرخەمیو کەلێن دانی زاناو بەناو زانایانی ئایینم دەکرد ، قەڵسو لالووت نابن ، چونکە تا ڕاددەیەکی چاک ئەوەی کە ئەودەمی دەمگوت و لەلای زۆربە جێی بڕوا نەبوو ، ئێستا بۆتە واقیعێکی بەرهەست و دیتراوو هیچ کەس نکوولی بۆ لێ ناکرێ !

بەڵام دیسان دەزانم کە ئەوەی ئێستاش دەربارەی زاناو پێشەوایان و بەڕواڵەت زاناو پێشەوایانی ئایین دەیڵێم ، زۆربەی یان لانی کەم هەندێکی لە ئاستی عەقڵ و تێگەیشتنی بەشێک لەو جۆرە خەڵکە گشتیو تایبەتی‌یەدا نیە ، بەڵام

واقیع دەبێ بگۆڕرێ و خواری و چەوتی دەبێ ڕاست بکرێتەوەو، کەسێکیش نەوێرێ ئەو ڕاستییانە بڵێ کە بە دڵی زۆربەیان هەندێک لە خەڵکی نین و، لە دەرگای تەسکی بیرو هۆشیانەوە ناچن، ئەوە بێگومان هیچ جیاوازی یەکی کردەیی‌و ڕاستەقینەی لەگەڵ ئەو خەڵکە عەوام‌و سادەیەدا نابێ کە هەمیشە چاوەڕێ ی شەپۆلی ڕۆژگارن کە هەرجارە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێک هەڵیان بگرێ‌و، وەک کۆلکە دارێکی بێ ئیرادەی دەستە پاچە هیچیان لەدەست نایەت.

ئنجا ئێمەش لە هیچ جێیەکی قورئانێدا سەنەدی بۆ نەکردووین کە هیچ کەسمان لێ عاجز نەبێ‌و هەموو کەس لێمان ڕازی بێ‌و سوپاسمان بکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە ڕای گەیاندوە کە زۆربەی خەڵکی هەقێ قبووڵ ناکەن ( وأكثرهم للحق كارهون ) !!

وه تێی گەیاندووین کە یەکێک لە خەسڵەتە هەرە مەزن و بنچینەییەکانی ئەو کەسانەی کە ئایینی خوای یان پێ دەبووژێنێتەوە ئەوەیە کە لە لۆمەنەی سەرکۆنەکەران بێ باکن : ( ولایخافون لَومَةَ لائِمٍ ) !!

جا ئێستاش با لە چەند خاڵێکی کورتدا چۆنیەتی خەتاباری و کەلێن دانی زاناو پێشەوایان سەبارەت بە بێ ئاگایی گەلی کورد لە ئیسلامی (۱) ڕاستەقینە بخەینەڕوو :

---

(۱) دەزانم کە بەشێک لەو بەناو زانا - یانەی کە لە ناسینی ئیسلامدا دووچاری نەزانیی ئاوێتە ( الجهل المرکب) بوو ون، بەم قسانەم دڵیان تێک هەڵدێو نێوچاوان - یان گرژ دەبێ، چونکە ئەوان پێیان وایە کە ئەوەی ئێستا خەڵک لەنێوخۆیدا بەڕێوەی دەبەن، ئیسلامەتییەکی تێرو تەواوەو، لەگەڵ ئەوەی سەردەمی پێغەمبەرو خولەفای ڕاشیدین هێندەی سەرە دەرزییەکی جیاوازی نیە ! بەڵام دەبێ ئێمە سەرەتا دووعا بۆو جۆرە

١ـ ئايين كورت هەڵێنان لە لایەنی مەعنەوی و لە بواری شەخسیدا :

لەڕاستیدا ئەمە گەورەترین دەوری هەبوو لە سەر لێ تێکچوون و پەرتەوازە بوون و دووچاری ڕێچکان بوون و، ئیسلام لەبەرچاو سووک بوونی بەشێکی زۆر لە خەڵکی کورد، بەتایبەتی چینی ڕۆشنبیرو تازەپێگەیشتوو؛ چونکە گەلی کورد لەمێژ ساڵە تینوو و عەودالی ئازادی و سەربەخۆییو قەوارە هەبوونەو، کە دیتوویەتی بابای پێشەوای ئایینی بەرنامەو پەیڕەوی خوا لە جوغزی گچکەی پێنج درووشمەکاندا کورت هەڵێناوەو، سەروبەر لە چەند بابەت و مەسەلەیەکی شەخسیو مەعنەوی و قیامەتی بەولاوە هیچی دیکە نیە، لە دڵی خۆیدا گوتوویەتی : با ئیمانێ بە نیسکێ

---

گەسانەنە بگەین گە نەزانیەگەیان ئەنەو خەستیەی نەمێنیو ببێتە نەزانینی سادە ( الجهل البسیط ) ئنجا دواییش خوا بەڕوحمە .

نەسپێرم و بەتەما ئەم ئیسلامە گچکەو میسالی‌یە کەشکم فەریک نەبن و کۆزی خۆم ساوا نەکەم، چونکە نە ئەو درەنگە بەو زووەی ڕادەگاو، نە ئەو کورتە بەو بڵیندەی هەڵدەگا، فایدەی نیە (مەلا) هیچی لە هەگبەی دا نیەو، ئەو (ئاش) ەی کە ئەو دەیگێڕێ لە نەقەو ڕەقەو سەر ئێشاندن بەولاوە هیچی دیکەی تێدا نیە، کەواتە با چیدی بەدیار جەنابی مامۆستاو کەلام و کتێبەکانی‌یەوە دانەنیشم و، با بۆخۆم هەوڵێک بدەم و خەمێکی خۆم بخۆم و، بە ملاولادا بڕۆم !!

٢- هەڵوێست نەبوون سەبارەت بە حاڵ و باڵی گەل :

گەلێکی ستەمدیدەو بەشخوراوو کوت‌کوت‌کراوو نیشتمان بەشکراوی وەک کورد هەموو دەمێ وەک بابای بێ کراس هەر دوو گەز جاو لە خەونێدا دەبینێ،

بەڵێ ئەگەر لە بابای بەرسی بپرسی دوو و دوو (٢+٢) دەکاتە چەند، دەڵێ: دەکاتە : چوار (٤) کولێرە !!

بەدەردی پێشینانیش دەڵێن : بۆیە پێت دەڵێم خاڵە ، کە چوێلەکانم بۆ بگری !

جا سەد حەیف و هەزار مەخابن ، کە کە زاناو ماموّستایانی ئاینی ساڵەهای ساڵە گەلی ستەمدیدەو بێ کەسیان ( چوێلەکەی ئازادی و مافی ژیان هەبوون ) ی لەدەست هەڵفرێنراوەو ، ئەمانیش ڕۆژێک لە ڕۆژان نەهاتن بەناوی قورئان و سوننەت و ئیسلامەوەو لەژێر درووشمی ( ئیسلامەتی) دا خەمێکی گرتنەوەی ئەو باڵندەیە بخۆن .

بێگومان کەس ئینکاری لەوە ناکات کە تا ڕاددەیەک زاناو ماموّستایانی ئاینی وا هەبوون خەمیان لە خەڵکی خواردوەو بەشداری ئێش و ژانی

کەلەکەیانیان کردوە ، بەڵام حەیفێ خەم خواردن و کارکردنەکەیان لەسەر بنچینەی ( ئیسلام ) و بەپێی یاساو ڕێرەوونیەکانی قورئان و سوننەت نەبووەو ، کەمتریش وابووە بتوانن دەوری جڵەوبەدەست و فەرمانرەوا ببینن ، بەڵکو بەزۆری وەک پاشکۆ[1] ( ملحق ) وابوون !

جا هەڵبەتە ئەم خاڵی دووەمەش هەر زادەو بەرهەمی خاڵی یەکەمە ، چونکە مرۆڤ چۆن بیربکاتەوە هەر ئاواش دەژیو کەسێکیش بەرنامەی پان وپۆڕو هەمە لایەنەی خوا لە چوارچێوەی(شایەتمان و نوێژو ڕۆژوو و زەکات و حەج ) دا ببینێو ، هەر ئاواشی لە خەڵکی بگەیەنێ دیارە چەندەو چی ، بۆخۆی و خەڵکی چاندوە هەر ئەوەندەو ئەوەش لە پەریزێ هەڵدەگرێتەوە .

---

(١) پاشکۆ بوونی زانایان لە بواری

جا خوێنەری سەنگین !

هەڵوێست نەبوونی وەک پێویستی زانا و پێشەوایانی ئایینی هەویرێکە ئاوێ زۆر هەڵدەگرێ ، بەڵام ئێمە لێرەدا مەودای پێوەچوونی زۆرمان نیە ، دەنا پەیدابوونی دیاردەیەکی پیس و کوشندەی وەک ( خۆ بە دوژمن فرۆشتن ) کە ( جاشەتی ) زەقترین شێوەیەتی، دەبوو لەلایەن زانایانەوە ـ مادام خۆیان بە میراتگری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بزانن ـ گەورەترین ڕاپەڕینی لەسەر سازکرابا و توندترین و مەردانە ـ ترین فتوای لەسەر دەرکرابا ، کە بێگومان گەورەترین دەوری دەبوو لە

---

..................................

ناوبراودا بە زەقترین شێوەی لەو یەکیەتی زانایان ( اتحاد العلماء )ەدا دەردەکەوێ کە لەبن باڵی حیزبە عیلمانیەکان داو بەگوێرەی ئاراستە کردن ( توجیه ) ی وان بەڕێوە دەچوون . دەچن !!

گێڕانەوەی زۆر لە خۆفرۆشان و بەلای ئیسلامدا هێنانەوەی زۆربەی لەخشتە براوانی سەر بە ڕێچکان !!

هەروەها گەلێک مەسەلەی دیکە بۆ وێنە : لافی شێخایەتی لێدانی زۆر لە زڕە شێخانی دنیاخۆری سەر بە ڕژێمی دیکتاتۆرو، دووعاکردن و پاڕانەوە بۆ ڕژێم و دەستەڵاتدارە زۆردارەکان لەلایەن زۆر لە مەلایانی دین فرۆشەوەو، داوای مەهدی یایەتی کردن و .. هتد کە دەبوو هەرکام لەم دیاردەو نەخۆشییانە زۆر بە توندیو بە ڕوونی لەلایەن زانایانەوە بەرپەرچ درابانەوە، چونکە ئەم جۆرە دیاردانە گەورەترین دەوریان هەیە لە ناشیرین کردن و لەبەرچاو بێزاندنی ئایین و، سڵەمینەوەو پرینگانەوەی خەڵکیدا لەلایەکەوەو لە لایەکی دیکەشەوە، ئەم جۆرە دیاردانە دەبنە هۆی بەهەڵەداچوونی زیاتری خەڵکی

له ناسینی ئیسلام‌داو ، دانیشتن و (۱)
چاوەڕێ کردنی زۆر کەسیش بۆ پەیدابوونی
شتێکی ناسروشتیو یاسادڕ (خارِقُ العادة)و
ئەفسانەیی، دیارە ئەمەش کوشندەترین
دەردەو، دەتوانم بڵێم جۆرێکە له
بەنج کران و خەسێنران !

---

(۱) ئەم دیاردەیە ماوەیەک پێش ئێستا بە زەقترین شێوەی لەنێو خەڵکی نێودەشت و پشدەردا بینرا ، بەهۆی لاف لێدانی بوونە ( مهدی ) کوڕێکی خۆ لێ تێکچوو و هەق لێ وڕن بوو بەناوی ( مستەفا ) ، چونکە خەڵکە داماوەکە لەسەر قسەی وی کە گوتبووی لە دەربەندی بەپشتەوە ناگوازرێتەوە پشتێندیان لێ کردبۆوەو مەسرەفێکی زۆریشیان لە کارو کاسبی و کشت وکاڵ دا کردبوو ، بەڵام هەر هێندەیان زانی پیلانی پیس و نەگریسی بەعس خەون و مەونی کاک مستەفای وەدرۆخستەوەو خەڵکی ئەو ناوچەیەشی گواستەوە ، جا سەیر لەوەدایە کە ئێمە جاروبار نامەمان دەناردنەوە بۆ خەڵکی ئەو ناوچانەو رامان دەگەیاند کە ئەو برادەرە لە خۆی دا بەهەڵەدا چووەو ( مهدی ) نیە ، فەریکە مسوڵمانی وا هەبوو ، دەیگوت

٣ـ ئايين كردنه پيشه‌ى پێ ژيان :

مه‌سه‌له‌يه‌كى ديكه كه ده‌ورێكى يه‌كجار گرنگ و سه‌ره‌كى هه‌بووه له‌وه‌دا كه خه‌ڵك له ناسينى ئيسلام‌دا به‌هه‌ڵه‌دا بچن و، لێى دووربكه‌ونه‌وه‌و پشت په‌ل بن، ئه‌وه‌يه كه زۆربه‌ى هه‌ره‌زۆرى زانايانى ئايينى له كوردستان دا ( مه‌لايه‌تى ) يه‌كه‌يانيا كردۆته ده‌سته‌گيره‌و هۆى پێ به‌ڕێوه چوون و ژيان و گوزه‌ران .

مه‌سه‌له‌ى ( مه‌لايه‌تى ) كردنه پيشه‌ى پێ ژيانيش ديارده‌يه‌كى هێنده زه‌ق و ئاشكرايه، پێم وانيه حه‌وجێ به به‌ڵگه له‌سه‌ر هێنانه‌وه‌و سه‌لماندنێ بكات .

به‌ڵام ئه‌وه‌ى لێره‌دا پێويستى به

---

........................................

فلانكه‌س ( حه‌سووده ) ، جا دياره ئێستا ئه‌و برايانه بۆيان ده‌ركه‌وتوه كه له دوو سه‌ره‌وه به‌هه‌ڵه‌دا چووبوون ، پێشينانيش هه‌ر له حاڵێكى وادا بووه كه گوتوويانه :
" هه‌تا نه‌ينا له ته‌به‌ق نه‌يگوت (صدق)"

ڕووتکرانەوەو توێژرانەوە هەیە ،
ئەنجامی شوومو بەدی دیاردەی ناوبراو
بووە ، کە دەتوانین لە چوار خاڵان دا
بیخەینە ڕوو :
یەک : گۆڕران ( تحريف ) ی ئامانج و
مەبەستی نێررانی ئایین ، چونکە
هەموو بەرنامەکانی خوا بە مەبەستی
خوا بە خەڵک ناساندن و درەختی داد
چەقاندن هاتوون ، نەک کرێ وەرگرتن و
خۆ پێ ژیاندن ، وەک خوای بێ هاوتا بە
پێغەمبەری کۆتایی فەرمووە :
( قُلْ ما أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَما أَنا
مِنَ الْمُتَكَلِّفِيْنَ ) ص / ٨٦ .
دوو : لەبەرچاوی خەڵکی کەوتنی ئایین ؛
چونکە خەڵکی بەپێی سروشتی سادەو
سافی خۆیان بەڕێوەبردنی ئایین و
بەرنامەی خوا زۆر لەوە بە بەرزتر
دەگرن ، کە بهێنرێتە ڕیزی شوانی و
گاوانیو سەپانیو مزگەریو دوکانداری و

... بکرێته دەستەواژەی بژیو پێ پەیدا کردن و نان چنینەوە !

سێ : سووک بوونی باباى زانا لەبەرچاوی خەڵکی ، چونکە بە یارمەتیی دران و دەستگرۆیی کرانی لەلایەن خەڵکی یەوە ، شێوەو بیچمی ئەو نەدارو دەستکورتانە بەخۆوە دەگرێ کە دەرۆزەی دەرکـــان دەکەن .

چوار : چاوبەرەژێری و منەتهەڵگرتن و هەق پێ نەگوتران ، چونکە باباى مـــەلا ئەگەر لە پلەیەکی بڕوایی زۆر بەرزدا نەبێ ـ کە ئەمانەش زۆر کەمن ـ پێـــی وایە بژیوو ڕۆزی لەدەست ئـــــەو خەڵکەدایە کە یارمەتی دەدەن و ، دیارە لە حاڵێکی واشدا مەگەر چۆنەکایـــی دەنا ناتوانێ بە سەربەرزی و بێ منەتـی ئەو مەسەلانە بخاتەڕوو کە خەڵکەکـــە حەزیان لێ ناکات ، یان باری پێـــوە نەگرتوون .(١)

---

(١) چاکترین بەڵگەم لەم ڕووەوە مانەوەو

پێنج: سێنا بوونی کڕران و لەخشتەبران ؛

چونکە لەکاتێک دا بابای مەلا وەک پیشەو دەستەواژە (وسیلة) ی پێ ژیان تەماشای ئەرکی مەلایەتی بکات سەرنج دەدات، لەکوێ وە زیاتری بۆ بێ ڕوو لەوێ دەکات و سەڵەواتان لە دیداری وێ لێ دەدات، ئەو هەموو مەلاگەلەش کە بە ڕەوە لەسەر شاشەی تەلەفزیونی ڕژێمە طاغووتییەکان و، .. لەبەر دەرگای زۆردارو سامانداره خۆفرۆشەکان دا دەبینرێن و، وتارو دووعاو پاڕانەوە کڕراوەکانیان لەسەر مینبەرو لەنێو میحرابی مزگەوتەکان دا دەبیسرێن، چاکترین بەڵگەی ئیسپاتی

---

ڕەواج پێدرانی ئەو کتێبۆلکە ئەفسانەیی ـ یانەیە کە فریان بەسەر ئیسلامەوە نیەو، گەورەترین زیانیشیان هەبووە بۆ سەرلێشێواندن و چەواشەکردنی خەڵکی داماو، بۆ وێنە: (مولود نامە) (میعراج نامە)، (حیدر نامە) (یوسف و زلێخا).

ڕاستی ئەم قسەیەن .

ئنجا دەردی لە هەموو دەردان گرانتر ئەوەیە کە لەئاکامی ئەم ئەنجامە شووم‌و بەدەی ( ئایین کردنە پیشەی پێ ژیان ) دا ، باباى شوێن کەوتوو و دەهۆڵ کوتی ڕێچکان داشی سوار دەبێ و ڕێ ی بۆ ئاچووغ‌و تەیار دەبێ ، کە بلێ :



خەڵکینە !

مارکس‌و لێنین ڕاستیان فەرمووە کە ئایین تریاکی گەلانەو ، چەکی دەستی چینی بورژوا و ستەمکارە ، بۆ چەوساندنەوەو لێدانی چینی پرۆلیتاریاو نەدار ، تەماشاکەن چۆن زاناو چاوساغانی ئایین بوونە پەیژەو دەستەواژەو بڵیندگۆو بەڵێگۆی دەستەڵاتدارانی بەزەبروزۆرو دیکتاتۆری جۆراوجۆر !!

بەهەرحاڵ خوێنەری بەڕێز مەسەلەی

خەتاباریو کەلێن دانی زانـــاو (١)
چاوساغانی ئایین ، سەبارەت بــــە
بێ ئاگایی گەلی کورد لە ئیســـلام ،
باسێکی یەکجار بە لق وپۆپەو پێوەچوونو
قووڵ داچوون و پێداچوونەوەی زۆری ..
دەوێ ، بەڵام قەبارەی ئەم نامیلکەیــە
لەمە پتر مەوداما ن نادات .
ئێستاش کۆتایی بە باسی چۆنیەتــی
خەتاباری زاناو چاوساغانی ئاییـــن
دێنین و دەچینە سەر باسی خەتابـــاری
لایەنێکی دیکەی سێیەم .

---

١) بێگوما ن لەنێو گەلی کوردو هـــەر گەلێکی دیکەی مسولمانیش کەسانێکـــی زاناو چاوساغی وا هەر هەبوو ون کــە بگونجێ بەراستی بە زاناو پێشـــەوای ئیسلامو جێگرو میراتگری پێغەمبەران ،، علیهم الصلاە والسلام دابنرێن بـــەلام ئێمە قسە لە حالەتی گشتیو واقیعـــی بەرچاو دەکەین و ، دیارە نە ریزپـــەر ( شاذ ) یش یاسایان پێ هەڵدەوەشێنەوەو نە بە تاق تاقە گوڵانیش بەهـار دێ !!

سێ یەم: ڕۆشنبیرە ئیسلامی یەکان:

مەبەستم لە ڕۆشنبیرە ئیسلامیەکان (الأسلاميّون المثقّفون) ئەوانەن کە بە حیسابی خۆیان ماوەی چارەگە سەدەیەک زیاترە، لافی ڕێکخراوو کۆمەڵ (التنظيم والجماعة) هەبوون لێ دەدەن و، هەر کەسێکی بە ڕچەی وانیش دا نەڕوات ڕاست و چەپێک (x) بەسەر هەموو شتێکی‌دا دێنن و، بە زمانی حاڵ دەڵێن: ئێمەو ماموستایانمان و قوتابخانەکانمان تاقە خاوەنی شەرعیو ناطیقی ڕەسمی ئیسلامین و، دروست نیە هیچ کەس بەبێ ئیزن و فەرمانی ئێمە سووچی قسەیەکیش بقرتێنێ، چ جای هەنگاوێک هەڵێنێ!!

بەڵێ جا ئەو برا مسوڵمانە خاوەن ڕێکخراوو کۆمەڵ و دامودەزگا لەمێژینەو جۆراوجۆرانە کە هەتا ئێستا زیاتر زەمینەی تێدا پشکووتنی گوڵی جموجۆڵ و چالاکی‌یان مەیدانی (قسان) بووە،

به بڕوای من ئەمانیش پشک و بەشێکی
چاکیان لەو سووچو تاوان و خەتاباریە
گۆڕینەدا هەیە کە باسمان کرد !
چونکە ئەو برا عەزیزانە - خوا
عەیبەکانی خۆیانیان پێ بناسێنێ و ،
لەم خەوە درێژە وەخەبەریان بێنێ -
کەمتر وایە بە ئیسلامی مەلایانە قایل
بن !!
بەڵام پێم سەیرە کە بۆچی ئەوەی لە
مەلایانیدا بە ڕەخنە دەگرن ، لە
خۆیانیدا لانابەن و ڕێ یەکی چاکترو
ڕاستتر ناگرن ؟!
بەهەرحاڵ لەگەڵ ئەو برا بەڕێزانەدا
کە ئەگەر بەخۆدا بێنەوەو خۆبگۆڕن
زۆرم ئومێد پێن و گەلێکم دڵ پێ خۆشن،
بەڵام بە خستنەڕووی ئەم چوار خاڵە
کورتە واز لە باسی وانیش دێنین :
یەک : براینە ! شۆڕشی ئەیلول لە ساڵی
١٩٦١ ی زایینی سەری هەڵدا ، دەی ئەگەر

ڕاستە ئێوە پێش ئەوکاتە ڕێکخراوو کۆمەڵتان هەبوو و قسەو بیروڕاو هەڵوێست نواندنیشتان بەخۆتان بوو و سەربەخۆ بوون ، بۆ دەتان هێشت لەنێو گەلی کوردی مسوڵمانتان دا بۆ وەدەست هێنانی مافێکی شەرعیو ڕەوا شۆڕشێکی عیلمانی بەرپا بکرێ ؟!

ئایا ئێوەی ئیسلامی شیاوتر نەبوون کە ئەو مافە شەرعیە بۆو گەلە مسوڵمانە داوا بکەن ؟!

یان ئەودەمی پۆلیسی مسوڵمانتان پەروەردە نەکردبوون ؟!

ئەدی ئێستا ( مدیر شرطة ) کەتان ماوە؟

دوو: برایانی بەڕێز !

بەبێ پەردە پێتان ڕادەگەیەنم کە ئەوەی بڵاتە مایەی پووچ بوون و بێ بەرهەم بوونی کاری ئێوە، ئەفسانەی ڕێژە ( نسبة ) و پەروەردە ( تربية ) یە !!

کە یەکەمیان هیچ بەڵگەیەکی شەرعیو

عەقڵی لەسەر نیەو، دووەمیشیان بەو شێوەو چۆنیەتی‌یەی کە ئێوە دەیڵێن، وەک باڵندەی (عەنقا) ناوی بێ ناوبراوە!

چونکە هەروەک چۆن کەسێک بیەوێ بە مەبەستی بەهێزبوونی جەستەو ئەندامەکانی وەرزش بکات، بە دانیشتنەوە بۆی ناکرێ و دەبێ هەستێتە پێ‌و خۆی داپێچێ‌و قۆڵان هەڵبکا، بەهێزبوون و پەروەردەبوونی ڕووحیش بەهەمان شێوە، لە گەرمەی خەبات و جم‌وجۆڵ و چالاکی ـ یان دا نەبێ مەحاڵی کوڕی مەحاڵە!

سێ: نەخۆشی‌یەکی دیکەتان کە زەرەیشی زۆر بووە بۆ دابڕدابڕبوون و پەرتەوازەیی مسوڵمانان و پەیدابوونی دیاردەی جوغز جوغزێنە، ئەوەیە کە ئێوە خۆتان لەنێو جوغزو بازنەی چەند کتێب و بەرهەمێکی کۆمەڵێک لە زانایان دا کورت‌هەڵێناوەو پێتان وایە، ئیسلامی ڕاست و ڕەسەن

بەس لەو چەند کتێب و بەرهەمەدا چنگ دەکەوێ و، ئاوێ بێنەو دەستان بشۆ !!

چوار: عەیب و نەخۆشی‌یەکی دیکـــــەی کوشندەتان کە خەریکە فزرەتان لـێ ببڕێ ئەوەیە کە لەو ڕێکخراوو کۆمەڵە مسولمانانەی هۆگریان بوو ون و پێیانەوە ڕاهاتوون ، چەند جۆرە ( ئوممەتۆکە )یەکی گچکەتان دروست کردوون ، ئیدی سەرەنجام بەم ڕەفتارە چەوتەی ئێوە ئایەتی :

( إِنَّ هٰذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ ) الأنبياء / ٩٢ ، مەعنـــاو نێوەڕۆکی خۆی لەدەست داوە ، چونکـــە ئێوە چەند ناوتان داتاشیون ، هێنـــدە ئوممەتەشتان دروست کردوون ، لەگـــەڵ ئەوەش دا کە ئوممەتی ئیسلامی یــــەک ئوممەتەو خاوەنی یەک بەرنامەو یـــەک قیبلەو یەک ڕێبازو یەک ئامانج و یـــەک درووشمەو یەک پەروەردگاریشی هەیەو ، ئەو پەروەردگارەشی بەس یەک نـــاوی

لێ ناوە :( هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِنْ قَبْلُ وَفِي هٰذا ..) الحج / ٧٨ .

لە کۆتاییدا ئومێدم وایە دڵ تێکەڵ هاتنتان بە قسەکانم، نەبێتە پەرچ لە ڕێی تێوەڕامان و لێ حاڵی بوونیان دا، پێشینانیش گوتوویانە : " دۆست ئەوەیە کە دەتگریەنێو دوژمن ئەوەیە کە پێت پێ دەکەنێ " .

چوارەم: حیزب و ڕێچکە عیلمانییەکان[1]:

چوارەمین لایەن کە دەوری هەبووە لە کەمکردنەوەی ئاستی خواناسی و پەرەپێدانی دیاردەی بێ دینی لەنێو گەلی کورد دا، ئەو حیزب و ڕێچکە سەر بە بیردۆزە ڕۆژهەڵاتیو ڕۆژئاوایی ـ یانە بوو ون کە بە حیساب بۆ ڕزگاری

(١) زۆرکەس وشەی ( عیلمانی) بەوە حاڵی دەبن، کە دژی نەزانین ( جهل ) بێ، جا هەرچەندە لە ڕواڵەتدا وایە، بەڵام لەڕاستیدا مەبەست لەم وشەیە دژی ئایینیو دژی غەیبییە .

گەلی کوردو بەمرادگەیاندنی هاتبوونە کایەوە، بەڵام ... !

جا بەهەرحاڵ ئێمە نکوولیمان لەوەی نیە کە هەرکام لەو حیزب و ڕێچکانەی هەرکام لە بەشەکانی کوردستانی بەریس پێشمەرگەی زۆر ئازاو چاپووک و بەهەڵمەتیان هەبوو ون و، زەبری زۆر گرچووبڕیشیان لە دوژمن داوە، بەڵام ئێمە دەڵێین :

یەک : هەرچەندە زۆربەتان لە کارەکەتاندا دڵسۆز بوو ون - دیارە هەشتانە دڵسۆز نەبووە - بەڵام دڵسۆزی بەتەنێ مرۆڤ بەئامانج ناگەیەنێ و دەبێ ڕێگەو شێوازو چۆنیەتی ڕاست و دروستیش بۆ ئامانجەکەی بگرێتەبەر دەنا بەئامانج ناگاو دەبێتە سەپانی پووشێ، جا پێیم وایە هەرکامێکتان بەویژدانەوە سەرنجی پەرێزی کارەکەی بدات دڵنیا دەبێ کە پووشی پێ بڕاوە !

دوو: ئێوە هەمووتان لە بڕوا پێ نەبوونی ئایین دا وەک بەرنامەو پەیرەوی ژین ، یەکسانن ، بەڵام هەڵدو پێدا و بەرزی و نزمی تان زۆرە، چونکە ئی واتان هەبووە کە گوتوویەتی :( هیچ شتێک ئەوەندەی ئیسلام زیانی لە کورد نەداوە) [1] ، وە ئی واتان هەبووە لەسەر شانۆ قورئانی خواو مێزەری مەلای وەبەر شەقان داوە !!

بەڵام هەشتان بووە هەڵوێستی هێندە زەق نەبووەو، جاروبار بۆیەیەکی ئیسلامانەشی لەخۆی داوە .

وە هەشتان بووە هەر لە ناسینی سروشتی ئیسلامدا بەهەڵەدا چووە دەنا تا ڕاددەیەک ڕێزو حورمەتی ئایینی پاراستووەو لە هەندێک بواران دا پابەندیشی هەبووە .

---

(1) لە کتێبی (سۆزی نەتەوایەتی) دا بە هەست وخۆڵتی وەڵامی ئەو جۆرە قسانە دراوەتەوە .

سێ: بەڵام پێم وایە ئێستا زۆربەتـــــان گەیشتوونە ئەو قەناعەتەی کە دەست لە دژایەتی کردنی ئایین هەڵبگرن و چیدی هەوڵی خەڵک هەڵگێڕانەوە نەدەن ، چونکە لە مەیدانی واقیعدا ئـــــەم ڕاستییانەتان بۆ دەرکەوتوون :

آ ـ لە بۆچوونی ( ئیسلام بە زیانبەخـــش لەقەڵەم دان ) تان دا بەهەڵــــــەدا چووبوون و هەر بیری خواناسییە کـــە بتوانێ وەک پێویست ڕووحی غیـــرەت و مەردایەتیو بەرەنگاری و پشـــوودرێژی بەبەر خەڵکیدا بکات و ، وەک بەنکـــە تەسبیحێک هەموویان بە دەزووی قایمـی بڕوا و برایەتی پێکەوە گرێ بدات و لەلای یەکیان شیرین و خۆشەویست بکات .

ب ـ هەر کۆڕو کۆمەڵێک بناغەکەی لەسەر خواناسیو پارێزکاری بنیات نەنـــرێ زۆر نابات ، پاش ساردبوونـــــەوەو نیشتنەوەی گەرموگوڕی و کوڵ وکـــۆی

هەڵچووی هەست و نەستی گەرمە تەریقەتی‌یان ، سەریان لە یەکتر بوغزاندن و، یەکتر فرۆشتن و یەکتر کوشتنەوە دەردەچێ، چونکە حەتمەن حەتمەن ئینسان یان بە پاڵنەری خوایی دەجووڵێ، یان بە پاڵنەری دنیایی ، جا ئەگەر بە پاڵنەری خوایی بێ مەگەر خوانەخواستە لابدات ، دەنا مسۆگەر بە هەوا رو مەنزڵگای پاکی خۆی دەگات ، بەڵام ئەگەر پاڵنەری دنیایی بیجووڵێنێ لەسۆنگەی ئەوەوە کە دنیا کەم و کورت و سنووردارە،مەگەر بەدەگمەن دەنا لەگەڵ خەڵکە هاورێکانی‌دا تێک دەگیرێ و، سەرەنجام لەسەر ئامانجە کەم و سنووردارەکەیان بەشەردێن و تێک ڕۆ دێن !

پێنجەم: ڕژێمە طاغووتی‌یەکان :

لایەنی پێنجەم کە دەورێکی یەکجار گرنگی دیوە لە ( لە ئیسلام

دوورخستنەوە) ی گەلەکەمان دا ئـــەو
ڕژێم و دەستەڵاتە دیکتاتۆرو طاغووتی‌یانەز
کە تەنانەت مافی ( ژیان ) و (بوون)یش
بە کورد ڕەوا نابینن ، چ جای مافــی
دینداری و خواپەرستی .
جا بێگومان شوێن پەنجەی ڕەشی ئەو
ڕژێمە طاغووتی‌یانە بەتایبەتی ڕژێمـی
بەعس بەسەر ڕووپەری مێژوو و واقیعـی
ژیانی گەلی کوردو گەلانی دیکـــــەی
مسوڵمانەوە هێندە زەق و ئاشکرایـــە
حەوجێی بە ڕوونکردنەوە نیە .
بەڵام حەزدەکەم سەرنجی خوێنەر بـۆ
مەسەلەیەکی یەکجار گرنگ ڕابکێشم کـە
زۆر کەس بە بەراوەژووەوە لێی حاڵـی
بووە، ئەویش ئەوەیە کە زۆر کەســی
لەخشتەبراوو فریودراو پێیان وایە کـە
ئایین بۆتە هۆی چەوساوەیی و بەجێماوی و
مافخوراوی گەلی کورد !!
بەڵام زۆر خراپ حاڵی بووون، چونکە

حیزب و ڕژێمە طاغووتی‌یەکان بۆیە هێندە بە توندوتیژی لەگەڵ ئیسلام دا ڕووبەڕوو دەبن و، بۆیە هێندە بەگەرمی لە زەڕبەلێدان و لەبن هێنانی یان لانی کەم گۆڕین و شێواندنی دەخەفتێن، چونکە زۆر چاک دەزانن کە ئیسلام پتەوترین و مەحکەمترین قەڵاو سەنگەری گەلانەو، دیارە دوژمنیش لەکاتێک دا بیەوێ چاک زەفەر بە دوژمنی بەرێ، هەوڵ دەدات چاکترین و ستراتیژی ترین سەنگەرو لووتکەی لێ بگرێ، وە کەسێک بەتەما بێ بە زووترین کات و بە ئاسانترین شێوە دوژمنی لەنێو بەرێ، هەوڵ دەدات زەبری خۆی لە ناسکترین و گرنگترین شوێنی جەستەی بدات، وەک سەرو سینەی.

بەڵام حەیفێ (مسولمانان) ی خۆمان هەتا ئێستا هێندەیان شارەزایی لە ئایینەکەیان دا پەیدا نەکردوە کە پەی

بە گرنگیو بایەخی بەرن و، پەی بە حیکمەت و هۆی ئەو هەموو ترس و لەرزو بەربەرەکانیێی دوژمن بەرن سەبارەت بە ئایین و بەرنامە کۆن و لەمێژینەکەیان!!

خوێنەری بەرێزو خۆشەویست!

هیوادارم لە ئەنجامی ئەم باسەدا کە رابرد گەیشتبیە قەناعەت و دڵنیایی تەواو کە:

بەڵێ راستە لە ئیسلام بێ ئاگابوونو بە قورئان و سوننەت ئاشنا نەبوونی گەلی کورد کە بنچینەو ماکی هەموو گیروگرفت و دەردەکانیەتی، لە سەرلەبەری کوردستانی بەرینی بەشراوەدا!! ئاگرێک نیە بەس لە ریشی یەکێک و دووان هەستابێ، بەڵکو پەیدابوونی دیاردەی ناوبراو فیتی هەموانمانە:



١- تێکڕای خەڵکی
٢- زانایانمان (١)
٣- ڕۆشنبیرە ئیسلامییەکانمان
٤- حیزب و ڕێچکەکانمان (٢)
٥- ڕژێم و دەستەڵاتە طاغووتییەکانمان (٣)

---

(١) ڕەنگە یەکێک بپرسێ باشە بۆچی لە مەسەلەی خەتاباربوونی زانا و پێشەوایانی ئایین دا هیچ ڕووی ڕەخنەت لە شێخانی تەریقەت و تەصەووف نەکردو، کەم و زۆر نەت هێناونە نێو حیسابانەوە ؟! ئایا ئەوانیش لەو ڕووەوە خەتابار نین ؟!
لە وەلامدا دەڵێم: نەخێر شێخەکان لەو بارەوە جێی گلەیی نین و بەرپرسیاریش نین، چونکە ئەگەر شێخی ڕاستەقینەو چاک بووبن ئەوە دیارە ئەرکی سەرشانی خۆیانیان ئەنجام داوەو جێی گلەیی نین وە ئەگەر زڕە شێخیش بووبن ئەوە جێی گلەیی نین چونکە ئەو جۆرە شێخایەتییەش هەر جۆرێکە لە ئاغایەتی کردن و،دیارە ئێمە بابایەکی میرو بەگ و ئاغاش هەر هێندەی خەڵکە بێ عینوانەکە بە بەرپرسیار دەزانین، بگرە کەمتریش، چونکە ئەمانیش زۆربەیان وەک ڕاوچی خراپ لە ئاوی لێڵ دا ڕاوێ دەکەن و،ن لە بێ ئاگایی خەڵکەکە دەرفەتی چاکتریا وەرگرتوەو وەردەگرن .
(٢)،(٣) بۆیە ئەم دووانەشم پاڵداوەتەلای

کەواتە :

ئێستا وەڵامی نیوەی یەکەمی ناوو نیشانی ئەم نامیلکەیەمان داوەتەوەو دەزانین ( کوردستان بۆ ویران بوو ؟! ) ، مادام وابێ با هەرچی زووتر بچینە سەر وەڵامدانەوەی نیوەی دووەمی ئەو پرسیارە گرنگەی کە کردوومانەتە ناوو نیشانی ئەم نامیلکەیەو، با ئەمجار خەریک بین بزانین ( کوردستان چۆن ئاوەدان دەبێتەوە ؟! ) .



---

خۆمان ، چونکە ئەمانیش هەر ئێمە بووینە هۆی پەیدابوون و گەشەکردن و مانەوەیان !!

مەبەستیشم لە وشەی ( ئێمە ) ئێمەی گەلی کوردی مسوڵمانە .

# بەشی دووەم

# کوردستان

# چۆن ئاوەدان

# دەبێتەوە ؟!

# ڕێ خۆشکرێکی کورت

خوێنەری بەڕێز !

پەندێکی عارەبی هەیە دەڵێ :( فهم السُّؤال نِصْفُ الجَواب ) لە پرسیار گەیشتن نیوەی وەڵامدانەوەیەتی !

لەڕاستیدا ئەم پەندە لە زۆر جێیان تا ڕاددەیەکی زۆر ڕاست دەردەچێ ، جا ئێمەش سوپاس بۆ خواو لە لوتفی بێ سنووری بەزیاد بێت ، لە بەشی یەکەمی ئەم نامیلکەیەدا تا ڕاددەیەکی چاک توانیمان پەردە لەسەر ڕووی مەسەلەی ( هۆی وێران بوونی کوردستان) لابدەین، ئنجا وەک گوتراویشە ( الأشياءُ بأضْدادِها تعرفُ ) ، دیارە ئاوەدان کردنەوەش دژو پێچەوانەی وێران بوونە، کەواتە هەموو ئەو هۆیانەی کە وێران بوونی کوردستانیان لەگرەودا بووە، ئەوە

بێ پێچ‌وپەنا دژو پێچەوانەی ئەو هۆیانە ئاوەدان بوونەوەو خێروخۆشی کـــوردو کوردستان و هەر گەل و نیشتمانێکـــی دیکەی وەک وانیشیان لەگرەودایە .

مادام وابێ لەم بەشـــەدا زۆر حەوجێمان بە توێژینەوەو شیکردنـــەوەی ئەو خاڵانە ناکات کە ڕێ ی چارەســەری دەردی کوردو چۆنیەتی ئاوەدان کردنەوەی کوردستانیان بەکورتی تێدا دەخەینەڕوو .

ئەو خاڵانەش کە مەبەستی ناوبراویا تێدا دەخەینەڕوو، ئەم سێ خاڵەن کــە هەریەکێکیشیان بریتیە لە قۆناغێــک لە قۆناغەکانی گەیشتن بە ئامانجـــی ناوبراو :

١ــ بێداری و تێگەیشتن

٢ــ بارهاتن و پێگەیشتن

٣ــ بەمرادو ئامانج گەیشتن

# خاڵی یەکەم
# بێداری و تێگەیشتن

بەڵێ خوێنەری خۆشەویست !

هەنگاوی یەکەمی ئێمەی کوردی چەوساوەو هەر گەلێکی دیکەی چەوساوەو بەشخوراویش ئەوەیە کە لە خەوی بێ ئاگایی‌و نائاشنایی سەبارەت بە ئیسلام بێدار بینەوەو، پاشان بە شێوەیەکی ڕێک و ڕاست و بێ خڵتە لە ئیسلام حاڵی ببین و تێ بگەین ، چونکە وەک لە خاڵی دووەمی بەشی یەکەم دا گوتمان بنک و ئەسڵی هەموو هەڵەو خەتاو ناتەواوی یەکانمان بریتیە لە دووری و بێ ئاگایی‌مان لە ئیسلام ، ئیسلام وەک خوا ناردوویەتی و ، وەک .. پێغەمبەرو هاوەڵانی‌و جێ نشینەکانی صلی اللە علیە وآلە وسلم بەڕێوەیان

بردوەو جێ بەجێ یان کردوە، کەواتە هەنگاوی یەکەمی چارەسەرو ساڕێژبوونی برین و زامەکانیشمان هەر بریتیە لە هەڵکێشان و ڕیشەکێش کردنی ئەو بنک و ئەسڵە!

مەبەستیشمان لە بێداری، بێداربوونەوەو هاتنەوەسەرخۆی دوو جۆرە خەڵکە، جۆری یەکەمیان، کە هەتا ئێستا گومانیان وابووە کە ئیسلام تریاک و مێشک بەنجکەرو خەڵک خەسێنەرە، بێداربنەوەو بزانن کە لەم گومان و بۆچوونەیان دا ڕاست بە بەراوەژووەوە حاڵی بوو ون و، بەپێچەوانەوە ئیسلام وریاکەرەوەو زەین ڕوونکەرو دڵ بەهێز - کەرو خەڵک ڕاپەڕێنەرو شۆڕش هەڵگیرسێنەرو زۆردار خەسێنەرو دوژمن ڕەتێنەرە، دیارە هەموو ئەم مەعنایانەی گوتیشمن هەرکەسێک ویژدانی هەبێ ئێستا بەچاوی سەر لەسەر زۆربەی پارچەکانی

نیشتمانی ئیسلامیدا وەک واقیعێکی زیندوو و بەرهەست دەیانبینێ، وێڕای مێژووی (١٤٠٠) ساڵەی ئیسلام .

جۆری دووەمی ئەو خەڵکەی کە پێدا ڕبوونەوەو هاتنەوەسەرخۆی گەرەکە ئەو کۆمەڵە خەڵکەیە کە بە هەڵەوا لە ئیسلام حاڵی بوو ون ، کە بەس چەند مەسەلەیەکی مەعنەوی و شەخسییەو، تەنیا باسی چۆنیەتی پەیوەندی نێوا ئینسان و خودا دەکات و کەم و زۆر هەقی بەسەر سیاسەت و حوکمڕانیو ژیان و گوزەران و جۆرو چۆنیەتی بەڕێوەچوونی خەڵکی دا نیە .

وە مەبەستیشمان لە تێگەیشتن ( الفهم ) تێگەیشتن و لێ حاڵی بوونێکی ڕاست و دروست و بێ خلتەیە لە ئیسلام ، لەبەر تیشکی قورئان و سوننەت و بەرهەمو کەلەپووری ڕەسەنی زانا و پێشەوا میراتگرە ڕاستەقینەکانی ئیسلامدا .

وە ئێمە بڕواو قەناعەتمان وایە کە تێگەیشتنی ڕاست و ڕەوان و ساغ و سەلیم لە ئیسلام، لە گەرمەی جیهادو کارکردن و جموجۆڵ و چالاکیدا نەبێ مومکین نابێ، چونکە ئیسلام بۆخۆی بەرنامەو پەیڕەوی خەبات و تێکۆشان و کارکردن و هەوڵ دانە، وە قورئان و سوننەتیش کە دوو تاقە سەرچاوەی ڕوون و بێ چەندو چوون و متمانەپێکراوی ئیسلامن، لە گەرمەی جیهادو کارکردن دا هاتوونەخوارێ و، لەو جۆرە بارو دۆخەش دا نەبێ وەک پێویست نافامرێن.

ئنجا ئێمە بۆ وەسێنایی خستنی ئەم قۆناغی یەکەمە بۆ هاوزمانانی مسوڵمانی خۆشەویستم، دوو زنجیرە نامیلکەمان دەست پێ کردوون، یەکەمیان زنجیرەی ( با چاکتر ئیسلام بناسین ! ) کە دوازدە ئاڵقەیەو، ئاڵقەکانی ئەمانەن بە ڕیز :

( خودا ، پێغەمبەران ، ڕۆژی دوایی ، قەزاوقەدەر ، بڕوا ، ئایین ، ئینسان ، ژیانی دنیا ، کۆمەڵی خوا ، سیاسەت ، دادگەری ، مسوڵمانی کامڵ )[1] .

دووەمیان زنجیرەی ( بووژاندنەوەی ئیسلام ) ە ، کە ئەمیش لە چەند ئاڵقە - یەک پێک هاتوەو ، ئاڵقەی یەکەمیشی چاپ کراوە بەناوی ( ڕێبازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کامەیە ؟! ) .

ئیدی هیوادارم کە گەلی کوردی مسوڵمانمان بەهۆی تێگەیشتنێکی تێروتەواوو بێ خلتە لە ئیسلام ،

---

(١) کتێبی ( مسوڵمانی کامڵ ) کە ئاڵقەی دوازدەیەمی زنجیرەی گۆرینە بەتەنیا بەرنامەو پەیرەوێکی گونجاوە بۆ تێگەیاندن و پێگەیاندنی کۆمەڵێکی ئیسلامی، چونکە نیزیکەی (٦٠٠) لاپەڕەی قەبارە گەورە دەبێ‌و، باسی هەرکام لە ( تێروانین و بیروباوەڕ ) و (خواپەرستی)و ( خوو و ڕەوشت ) بە فراوانی دەکات .

ئەم قۆناغی یەکەمە ببڕێو، ئەندازەیەک لە پەڵەی ڕەشی سەر مێژووی موسوڵمانەتیی بسڕێ.

# خاڵی دووەم
## بارهاتن و پێگەیشتن

بارهاتن و پێگەیشتن ئەنجام و بەرهەمی سروشتیی برینی قۆناغی یەکەمە، چونکە هەرکەسێک بەرەو ئیسلام بێدار بۆوەو، ژیرانە بەخۆی دا چۆوەو، بەشێوەیەکی ڕێک و ڕاست و بێ خڵتە لەسەر بنچینەی قورئان و سوننەت و کەلەپووری ڕەسەنی زانا و پێشەوایانی ئیسلام لە بەرنامەو پەیڕەوی خوا حاڵی بوو، ئەو حاڵی بوون و تێگەیشتنەی و بڕوا و قەناعەت هێنانەی بە ئەندازەی

ڕاستی‌و ساغی‌و قووڵی‌و پته‌وی ی خۆی ، به‌ره‌و ئاسمانی له‌خوا نیزیک بوونه‌وه و زیاتر به‌خۆدا چوونه‌وه هانـــی ده‌داو ، وای لێ ده‌کات‌شه‌وو ڕۆژان پێکه‌وه گـری بدات‌و ، خه‌وو خۆراکان له‌خۆی تێک بدات ، له‌پێناوی له مه‌یدانی واقیع‌و ژیـان دا چه‌سپاندنی به‌رنامه‌ی خواو ، ئازادکردن‌و پاککردنه‌وه‌ی زه‌وی خواو ، ڕزگارکـردن و به‌خته‌وه‌رکردنی خه‌ڵکی خواو ، له‌نێوبردنی دوژمن و ناحه‌زانی ڕێ ی خوادا .

ئنجا له گه‌رمه‌ی ئه‌و به‌ره‌وخواچوون‌و به‌خۆداچوونه‌وه‌و ئیسلام ڕه‌نێوهێنـــان و خه‌ڵک به‌ره‌و ئازادی هێنان و داگیرکـه‌ر وه‌ده‌رنان و زوڵم‌و سته‌م ڕاونانه‌دا مرۆڤ مسوڵمان و خه‌ڵکی مسوڵمان ڕۆژ بۆ ڕۆژێ پترو چاکتر باردێ و ڕادێ و تێ ده‌گات و پێ ده‌گات .

که‌واته :

قۆناغی دووه‌می به‌ره‌و خێروخۆشـی و

بەختەوەری و ئازادی و سەربەخۆیی
چوونی ئێمەو هەر گەلێکی دیکەی وەک
ئێمەش و ، قۆناغی دووەمی دەست پێکردنی
چاککردنەوەو ئاوەدان کردنەوەی
نیشتمانی وێران و خاپوورکراومان ،
بریتییە لە کارکردن و جموجۆڵ و چالاکیو
خەبات لەسەر بنچینەی ئیسلام، سەرەتا
لە بواری تاکیو لە جوغزی زات و شەخسی
خۆمان دا لە هەرسێک بواری (تێڕوانین و
بیروباوەڕ) و (خواپەرستی) و (خوو و
ڕەوشت) دا ، واتە سەرەتای دەست بە
کار کردنمان دەبێ بریتی بێ لە دروست
کردن و پێگەیاندنی چەند کەسێکی
دانستەی وا کە بەڕاستی خاوەنی
(تێڕوانین و بیروباوەڕێکی عاقڵانەی
ئیسلامییانە) و (خواپەرستی یەکی
ساڵحانە) و (خوو و ڕەوشتێکی خوایی
-یانە) بن ، بۆ ئەوەی دواتر بتوانن
ببنە بناغەو بنەمای بەرپاکردن و

جۆش دانی ( خەبات و جیهادێکی مەردانە ) بۆ لابردنی ستەم و خراپە ( الظلم والفساد ) و چەسپاندنی دادگەری و چاکە ( العدل والأحسان ) !!

لێرەدا ڕەنگە پرسیارێک بێتە پێشێ:

باشە تۆ لەلایەکەوە ئەسڵ و بنچینەی باسەکەت لەسەر چۆنیەتیو ڕێگەی ئاوەدان کردنەوەی کوردستان و ئازادیو ڕزگاری گەلی کوردی موسڵمان دادەمەزرێنیو کەچی لەلایەکی دیکەوە ، بازدەدەی بۆسەر مەسەلەیەکی دیکە ، کە بریتیە لە ( ڕێگەو چۆنیەتی بووژاندنەوەی ئیسلامو چەسپاندنەوەی حوکمو بەرنامەی خوا ) ئایا ئەم ئەمبەر ئەوبەر کردنەت چی تێدایە ؟! )

لە وەڵامدا دەڵێم :

لەڕاستیدا بەس بۆ کەسانێک کە بە سروشتی ئیسلامو ئامانجو مەبەستە بەرزو پیرۆزە هەمەلایەنەکانی شارەزا

نین ، ئەم ڕەفتارەی ئێمە جێی سەرسوورمان و پرسیارە، دەنا کەسێک سەرەدەرلێک لە حەقیقەتی ئیسلامەتی دا بکات، زۆرچاک دەزانێ کە بووژاندنەوەی ئیسلام بەهۆی بارهێنان و پێگەیاندنی کۆمەڵە خەڵکێکی کوردستانەوە لەسەر بنچینەی یاساو دەستوورەکانی ئیسلام؛ یانی ئاوەدان کردنەوەی کوردستان و ڕزگاربوون و ئازادبوونی‌و، هێنانەوەکایەی خێروخۆشی‌و پیت وپێزو بەختەوەری بۆ خەڵکی کورد، واتە ئێمە؛

( ئاوەدان بوونەوەی کوردستان ) و ( بووژاندنەوەی ئیسلام ) بە دوو ڕووی یەک حەقیقەت دەزانین ، چونکە هەر شوێنێک بەڕاستی‌و ساغی ئایین و بەرنامەی خوای تێدا ببووژێتەوە، بەهۆی تێگەیشتن و پێگەیشتنی خەڵکەکەیەوە ، ئەوە مسۆگەر ئەو شوێنە بە ئەندازەی بووژاندنەوەی ئیسلام ڕوو بە خێروخۆشی‌و

ئاوەدانی دەڕوات و بەرەوپێش دەچێت.

خوای کاربەجێ بە ڕاشکاوی لەوبارەوە فەرموویەتی:

(وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَىٰ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ..) الأعراف/ ٩٦ . واتە:

وە ئەگەر هاتبا و خەڵکی ئاوەدانییەکان بڕوایان هەبا و پارێزیان کردبا، ئەوەی بێگومان لە ئاسمان و زەوی یەوە دەرگا پیت و پێزو خێروخۆشی مان لەسەر دەکردنەوە..

وەک دەبینین خوای زانا و وردبین لەم ئایەتە بەپێزەدا دوو خەسڵەتی لە خەڵکی شارو دێهاتەکان دا بە مەرج گرتوون و، کردوونی بە قیمەت و نرخی دەروو لێکرانەوەو پیت و پێزو خێرو خۆشی بەسەردا ڕژان، ئەو دوو خەسڵەتەش بریتین لە بڕواو پارێزکردن (الأيمان والتقوى). بە واتایەکی دی

بریتین لە بیروبڕوا و بەرنامە ( العَقیدة والشَّریعة ) ی ئیسلامی .

بەڵێ وەرگرتن و هەزم کردنی بیروباوەڕی ئیسلامیو جێبەجێ کردن و چەسپاندنی بەرنامەکەی لەلایەن هەر گەلێکەوە مایەی خێروخۆشیو بەختەوەریو بەمرادگەیشتن و بە ئامانج گەیشتنی یەتی .

ئێستاش با بچینە سەر خاڵی سێ یەمو کۆتایی :

# خاڵی یەم

# بەمرادو ئامانج گەیشتن

بەمرادو ئامانج گەیشتنی گەلی کوردو هەر گەلێکی دیکەی مسولمانیش ئەنجام و بەرهەمی چاوەڕوان کراوی دوو خاڵ و قۆناغی پێشوویە .

چونکە مێژووی (١٤٠٠) ساڵەی ئیسلام چاکترین و بەهێزترین بەڵگەو شایەدە کە هەر گەل و کۆمەڵێک بەهۆی بانگی زوڵاڵی ئیسلام و قورئان و وریاو بێدار بووبێتەوەو بەڕاستی لێی حاڵی بووبێ و تێی گەیشتبێ و ، پاشان لە گەرمەی پابەندبوونی و بەرەوخوا چوونی و بەخۆدا چوونەوەی دا لەسەر بەرنامەو پەیڕەوی تێروتەواوی خوا بارهاتبێ و لە بۆتەو قاڵبی جموجۆڵ و چالاکییان قاڵ بووبێتەوەو پێکەیشتبێ ، یەکسەر

دوا بەدوای ئەو دوو قۆناغـــــــــی ( تێگەیشتن و پێگەیشتـــــــن ) ە ، ڕێ ی بەرەو ئامانج ڕۆیشتنی گرتۆتە بەرێ و بە پلیکانەو پەیژەی عیـــــــزەت و مەردایەتیو بەختەوەری و خێروخۆشی دا بەرز بۆتەوەو چۆتە سەرێ !

سەرگوزشتەی ژیانی هەرکام لــــــە عارەب و تورک و فارس و بوەیهـــــــی و غەزنەوی و سەلجووقیو ئەییوبـــــــی و ئەتابەکیو .. هتدەکانیش چەند دیمەن و تابلۆی زەقی ئەو مێژووە پان و بەرینو دەوڵەمەندەن .

هەڵبەتە مەبەستیشم لەو ( مــــرادو ئامانج ) ەی کە دڵنیام گەلی کــــوردی موسوڵمان بەهۆی ئیسلامەوە پێی دەگـات ، بریتیە لە ئاوەدان بوونەوەی کوردستانی ویران و گەڕانەوەی خێروخۆشـــــــی و بەختەوەری و ئازادی و سەربەخۆیی بـــۆ گەلی کورد ، چونکە وەک پێشتر گوتـــم :

لە هەر شوێنێک بەرنامەو پەیڕەوی خوا بەڕێوە ببرێ و بچەسپێ، حەتمەن حەتمەن سێبەری لوتف و بەزەیی پڕ پیت و پێزی خوای بەسەردا دێ و لێزمەی بارانی نازو نیعمەتی ماددی و مەعنەوی بەسەر دانیشتووانی دا دەڕژێ .

چونکە وردو درشتی بوونەوەری پان و بەرین هەر لە گەردیلانەوە بیگرە هەتا کەهکەشانە زلەکان گەردن کەچ و فەرمانبەری خوایەو، بە موو لە فەرمانی دەرناچن ، جا کاتێک خەڵکیش لەگەڵ بوونەوەردا هاو ئاواز بوون و مل کەچی بەرنامەی خوا بوون ، مانای وایە لەنێوان ئینسان و دەوروبەری دا سوڵح و ئاشتی و تەبایی بەرپا دەبێ و، دیارە هەموو دەمێش پیت و پێزو خێروخۆشی رادەو هەڵقوڵاوی سەرچاوەی سوڵح و سەفاو تەبایی و ئاشتییەو ،خوای زاناش ئاوا باس و خواسی نووح علیە السلام و گەلەکەیمان بۆ دەگێڕێتەوە :

( فقلت استغفروا ربكم إنه كان غفاراً . يرسل السماء عليكم مدراراً . ويمددكم بأموال وبنين ويجعل لكم جنات ويجعل لكم أنهاراً ) نوح / ١٠،١١،١٢ .

واته : ـ نووح فەرمووی ـ بە گەلەکەمی گوت : داوای لێبوردن لە پەروەردگارتا بکەن ، بێگومان ئەو زۆر لێبوردەیە . بارانی بە خورزەمتان بەسەردا دەبارێنێ . وە سامان و کوڕانتان بۆ زیاد دەکات و چەندان باغات و ڕووبارتان بۆ دەڕەخسێنێ .

کەواتە خوێنەرانی بەڕێزی کورد !

با ئێمەش داوای لێبوردن و چاوپۆشی لە خوای پەروەردگارو میهرەبانمان بکەین و بگەڕێینەوە ژێر سایەی ئایینو بەرنامەکەی ، بۆ ئەوەی دەرووی خێرو خۆشی یانمان لێ بێتەوەو ، خاک و وڵاتمان ئاوەدان بێتەوەو ، ئەم باری مەینەتیو کوێرەوەری و ژینتالیو

وه با لهكۆتاییدا گوێی دڵمان شل بکهین بۆ چهند موژدهو گفت و بهڵێنێکی خودایی، که خوای میهرهبانی دۆست و یاوهری چهوساوان و پشتشکێنی زۆرداران له قورئانی قسهلهجێی و بههێزو پێزدا فهرمووونی :

( وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ، وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْناً ..) النور / ٥٥(١)

---

(١) واته: خوا گفتی بهوانهتان داوه که بروایان هێناوهو کردهوهی چاک دهکهن کهحهتمهن جێنشینیان بکاتله زهویدا ههروهک چۆن ئهوانهی پێش وانی کردبۆ جێنشین، وه بێگومان ئهو ئایینهی که بۆی پهسند کردوون بۆیان دهچهسپێنێ، وه لهدوای ترس- و ناڕهحهتی - هێمنی - و خێروخۆشی - یان بۆ دهڕهخسێنێ ..

( وَنُرِيْدُ أَنْ نَمُنَّ عَلَى الَّذِيْنَ اسْتُضْعِفُوا فِي الأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الوَارِثِيْنَ ) القصص / ٥ . (١)

( يا أَيُّهَا الَّذِيْنَ آمَنُوا إِنْ تَنْصُرُوا اللَّهَ يَنْصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ) محمد / ٧ (٢)!

ئیدی بەئومێدی ئەوەی کە گەلەکەمان گۆڕانێکی وا بەسەرخۆی دا ببێنێ و، بە شێوەیەک خۆی تێ بگەیەنێ و پێ بگەیەنێ کە شایستەی ئەوە بێت ، خوای دادگەرو میهرەبان موژدەو بەڵێنەکانی خۆی بۆ بەجێ بێنێ .

رَبَّنا آتِنا فِي الدُّنْيا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النَّارِ .

---

(١) واتە : وە دەمانەوێ کە چاکە لەگەڵ ئەوانەدا بکەین کە لە زەوی دا چەوسێنراونەوە، وە بیانگێرین بە پێشەوا و بیانگێرین بە میراتگر .

(٢) واتە : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ئەگەر خوا وەسەربخەن ، سەرتان

............................................

---

دەخات و بۆ یەکانتان دەچەسپێنێ ا٫
( مەبەست لە وەسەرخستنی خوا هەوڵدانە بۆ چەسپاندنی ئایین و بەرنامەکەی ) ٠

# پێ خۆشکردنی کورت

خوێنەری سەنگین !

خوا پشتیوان بێ هەوڵ دەدەین لەم پاشکۆیەدا دوو مەسەلەی گرنگ کە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە بابەت ( موضوع ) ی ئەم نامیلکەیەوە هەیە بتوێژینەوە .

یەکەم: ( ڕەواندنەوەی چڵکە هەوری گومانێک ) .

دووەم: ( چەند ڕێروونییەک بۆ برایانی نوێ ئیسلامی ) .

هیوادارم توانیبم هەم چڵکە هەورەکەش بڕەوێنمەوەو، هەم چەند ئامۆژگاریو ئاگاداریەکی بەسوودیش پێشکەشی ئەوانە بکەم کە لە ڕێچکەو بیردۆزان بێزار بوو ون و، دانیان بە هەڵەداچوویی خۆیان دا هێناوەو، دەیانەوێ جارێکی دی بەپێی نەخشەو خەتێکی دی تێ هەڵچنەوە .

# ڕەواندنەوەی چڵکەڵەوەری گومانێک

زۆر جاران وابووە کە لەگەڵ کەسانێکی (کوردپەروەر) و (دڵ بۆ کورد هەڵپڕووزاو) دا دانیشتووم و، مەسەلەی ڕزگاری و ئازادی کوردم لە ڕێی ئیسلامەوە خستۆتەڕوو، ئەو برادەرانە گوتوویانە :

جاخۆ کاکە تۆ کە هێندە لەسەر ئەوە سووری کە ئێمە بەس لە ڕێی ئیسلامەوەو بەهۆی قورئانەوە دەحەسێینەوەو بەمراد دەگەین ، پێویست ناکات هێندە خۆت ماندوو بکەی و هێندە خەریکی بەڵگە هێنانەوە بی لەسەر سەلماندنی ئەوە کە گوایە ( ئەگەر پەنا بەرینە بەر ئیسلام و بگەڕێینەوە لای خوا ئەوە مسۆگەر ڕزگار

دەبین و لەداوی چەوسێنرانەوە قوتار دەبین ) ، چونکە گەلی کورد لەوەپێش چەند جارێکیش لەسەر بنچینەی ئیسلام جموجۆڵ و شۆڕشی کردوەو هانای بۆو ( پەنا ) یەش بردوە ، بەڵام دیسان هەر هیچی بەهیچ نەکردوە !!

بەڵێ خوێنەری بەڕێز !

ئەم قسەیەی گوترا چڵکە هەوری گومانێکە بە ئاسمانی لێڵی دڵی زۆر لە کوردپەروەران و دڵ هەڵپڕووزاوانە - وەیەو ، حەتمەن حەوجێی بە ڕاونان و ڕەواندنەوەیە .

جا ئەوە لە چەند خاڵێک دا هەوڵی ڕەواندنەوەی ئەو چڵکە هەورە ڕەش و بە غەورە دەدەین :

١- جارێ بەر لە هەموو شتێک پێویستە ئەوە بزانرێ کە ئیسلام بەوە قایل نابێ، کە وەک هوو وەسیلە سەیربکرێ و بکرێتە پەیژەی پێدا وەسەرکەوتن بۆ

وەدەست هێنانی ئامانجو مەبەستێــــک ، چونکە بەڕێوەبردنی ئیسلام خۆی لەخۆیدا بەرزترین و پیرۆزترین ئامانجو مەبەستەو مایەی ڕازی بوونی خوایە .

٢- ئەگەر مەبەست لە جموجۆڵ و شــۆڕش و ڕاپەڕینە ئیسلامی‌یەکانی کورد ئەو جم و جۆڵ و شۆڕشانە بن کە خەڵکی مسولمانــی کوردو کەسانی مسولمان و خوانــــاس و گەلێک جار زانا و پێشەواش پێیـــــان هەستاون ، ئەوە دەبێ بڵێین :

بێجگە لە چەند حیزب و ڕێچکەیەکـــــی هاوچەرخو نوێ ، هەموو شــــــــۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کورد ( ئیسلامی ) بوون !!

دیارە ئەمەش نە ئێمەی ( ئیسلامی ) و نە ئێوەی ( نائیسلامی ) پێی ڕازی نین .

٣- وە ئەگەر مەبەست لە جموجــــۆڵ و ڕاپەڕینی ئیسلامی، هەبوونی هەندێـــــک پێڕو تاقمی بەناوو ڕواڵەت ئیسلامی و، لەڕاستی‌و نێوەڕۆک دا ( ئیستیسلامی ) بێ،

كه زەڕی زۆریان بۆ ناوو ئابڕووی ئیسلامو مسولمانان هەبووەو، زۆر كەسی هەلپەرست و دنیادۆستیان تێوەرووكاوەو مۆرێكی ڕەش و زەقیشیان بە نێوچاوانی خۆیانەوە ناوە، ئەوە دەلێین :

ئەو مەسەلە كوردی یە لە ئێوە ڕووی داوە كە دەلێ :

" لە بێ خەبەران كەشكەك سەلەوات " !

٤- ئێستا كە زانیمان حال و وەزعی ئەو چلكە هەورە چۆنە، با بزانین هۆی پەیدابوونی چی یە ؟!

لەڕاستیدا ئەوەی كە بۆتە هۆی پەیدابوونی گومانی گۆرین ئەوەیە كە خاوەنی گومانی ناوبراو لە ئەنجامی بێ ئاگایی لە ئیسلامو شۆڕش و خەباتی ئیسلامی یانە وای زانیوە كە هەركاتێك بابایەكی شێخو مەلا یان كابرایەكی بەناو ئیسلامی ڕاست بۆوەو ڕاپەڕی، ئەوە ئەو ڕاست بوونەوە ( قیام ) و

ڕاپەڕینەی کە ئەو جۆرە کەســــــە ڕابەرایەتی دەکات و بەڕێوەی دەبــات ، بە ڕاپەڕین و هەستانێکی ئیسلامــــــی لەقەڵەم دەدرێ ، بەبێ لەبەرچاوگرتنــی ئەو بەرنامەو پەیڕەوو پڕۆگرامەی کــە خەبات و جموجۆڵەکەی لەسەر بەڕێــــوە دەبردرێ !!

وە بەبێ لەبەرچاوگرتنی جـــــۆرو چۆنیەتی هەڵس و کەوت و ڕەفتــــــارو ئاکاری ئەندامانی وردو درشتیو ، چۆنیەتی ئامانجو مەبەستە دوورو نیزیکەکانیو ، ماهیەتی دۆست و پشتیوان و لایەنگرانــی لەلایەکەوەو ، دوژمن و ناحەزانــی لــە لایەکی دیکەوە !!

جا بێگومان هەرکەسێک سەرەدەرێــک لە ئیسلامدا بکات و لەبەر تیشکـــــــی ئەو هەل و مەرجانەدا کە باسکــــــران سەرجەم ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی گەلی کورد بوات ناتوانێ بڵێ هیچکام لە جموجـــۆڵ و شۆڕشەکانی گەلی کوردی هەموو بەشەکانی کوردستانی بەرین ، ( ئیسلامی ) یانــە

بوو ون ، چونکە دەزانێ کە هەروەک چۆن
هەرکام لە شۆڕشی مارکسیستانەو شۆڕشی
سۆسیالیستانەو شۆڕشی ناسیۆنالیستانەو
شۆڕشی دیموکراسی‌یانەو .. هتد خاوەنی
بیچم‌و کەسایەتی‌و درووشم‌و نیشانەی
سەربەخۆن و ، چەند مەرجێکیان تێدا
هاتوونەدی بۆیە ئەو ناوانەیان
لێنراون ، شۆڕش‌و جم‌وجۆلی ئیسلامی
- یانەش خاوەنی چەند تایبەتمەندی‌یەکی
سەربەخۆو چەند درووشم‌و نیشانەیەکی
دیاری کراوەو هەروا بە گۆترە ناوی
( ئیسلامی لێ نەنراوە !!
ئنجا بۆ ئەوەی هیچ کەس بە هەڵە
لەم قسانەم حاڵی نەبێ، بە ئاشکراترو
بێ پەردە تر دەڵێم :
ئێمە هەرکام لە ( یەزدان شێرو
شێخ عوبەیدیللای نەهری و شێخ
عەبدولقادری شەمزینان و هەمزاغای
مەنگورو شێخ سەعیدی پیران و شێخ

مەحمودی حەفیدو سمایلاغای سمکۆو مەلا خەلیلی گۆڕەمەری و قازی موحەممەدو مەلا مستەفای بارزان ) خوا لێیان خۆش بێ ، بە ئینسانی مسوڵمان و شۆڕشگێڕو نیشتمان پەروەر لەقەڵەم دەدەین ، بەڵام نە هیچ کام لەمانە گوتوویانەو نە ئێمەش دەڵێین : کە ڕاپەڕین.و جموجۆڵەکانیان ئیسلامیانە بوو ون ، بەڵکو زیاتر مۆرکی کوردایەتیو دیموکڕاتیو عەشایری و شێخایەتیو مەلایەتی بە جموجۆڵەکانیانەوە هەبووە .

وە بە بڕواو بۆچوونی ئێمەی(ئیسلامی) گەورەترین هۆی شکستو تێشکان و بە ئاکام نەگەیشتنیشیان هەر ئەوەبووە (١)

---

(١) دوو ئاگاداری :
یەکەم: لە نامیلکەی ( مەسەلەی کورد )و کتێبی ( سوزی نەتەوایەتی) دا تا ڕاددەیەک پێناسەی جموجۆڵە بەناو ئیسلامیو بە نێوەڕۆک (ئیستیسلامی)یەکانما

تێ ببینی :

هەرچەندە شۆڕشی مەلا مستەفای بارزانی خوا لێی خۆش بێ وەک هەرکام لەو جسم و جۆڵ و ڕاپەڕینانەی پێش خۆی ، بەناوی ئیسلامەوەو لەژێر دروشمی ئیسلام دا نەبووە ، بەڵکو بەناوی ( پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق)ەوە بووە ، بەڵام خوا هەڵناگرێ وەک لە چەندان کەسەوە پێمان گەیشتوە ، شەخسی ( بارزانی ) لە هەموو ئەوانەی پێش خۆی زیاتر پابەندی ئیسلام و یاساکانی بووەو ، ڕووی لە جێبەجێ کردنی شەرع بووە ، بەڵام بێگرمان لەلایەن هەندێک لە کاربەدەست و دەمڕاستانی ئەو شۆڕشەوە گەلێک جاران بەبێ ئاگاداری (بارزانی ) کردەوەو ڕەفتاری دزێوو ناقۆڵاو ستەم و زۆری ئاغایانە دەرهەق بە خەڵکی کراوە .

---

.................................

کردوە ، دەتوانی سەرنجیان بدەی .

دووەم : برادەرانی کوردپەروەر وێڕای

ئەو گومانەی سەرێ ، گومانێکی دیکەشیا هەیە جاروبار بە حیسابی خۆیان وەک بەڵگە دەیخەنەڕوو ، ئەویش ئەمەیە :
( ئێمە وەک کورد دەچەوسێینەوە نەک وەک مسوڵمان ، کەواتە پێویستە شۆڕش و خەباتەکەمان لەسەر بنچینەی کوردایەتی بێ نەک ئیسلامەتی !! ) .
جا ئێمە لەبەرئەوەی هەم لە نامیلکەی ( مەسەلەی کورد ) و هەم لە کتێبی ( سۆزی نەتەوایەتی ) دا تەمومژی ئەم بۆچوونە هەڵەیەشمان ڕەواندوتەوە ، لێرە خۆی پێوە ماندوو ناکەین و خوێنەرانی بەڕێز حەواڵەی وێ دەکەین .



# چەند پرۆژەیەك بۆ برایانی نوێ ئیسلامی

پێشەكی دەڵێم :

مەبەستم لە ( برایانی نوێ ئیسلامی ) ئەو كەسانەن كە هەتا ئێستا شوێن كەوتوو یان لایەنگری ڕێچكەو بیردۆزە دەستكردەكان بوون ، بەڵام پاش چەند تەجرووبەی تاڵ و سوێرو دەست لە بنی هەمبانەی بەتاڵ دەرچوون ، پەندیان وەرگرتوەو بۆیان دەركەوتوە كە جگە لە بەرنامەی خوا ، هیچ ڕێ یەكی دیكەی ڕاست نیە بۆ سەرفیرازیو بەختەوەری و بەمرادگەیشتن ، بۆیە ئێستا بایان داوەتەوە یان دەیانەوێ بادەنەوە سەر خەتی خواو پێغەمبەرو صلی الله علیه وسلم بگەڕێنەوە نێو باوەشی ئیسلام .

ئنجا با چەند ئامۆژگاریو ڕێڕوونی
- یەکی کورت و پوخت وەک دیاری و
پێشوازی کردن و بەخێرهێنانی ئەو برا
مسوڵمانانە بخەمەڕوو :

١- بێگومان هەروەک چۆن لەنێو خەڵکی دا
بەگشتی ( مسوڵمان ) و ( نامسوڵمان)هەن
لەنێو ڕیزی مسوڵمانانیش دا (ئیسلامی) و
( نائیسلامی ) هەن !!

جا ئێمە ئامۆژگاری ئەو برادەرە
تازە گەڕاوانە دەکەین کە هەوڵ بدەن
بە مەعنای وشە خۆیان بکەن بە
( مسوڵمانی ڕاستەقینە ) واتە بابایەکی
ئیسلامی، چونکە وشەی ( مسوڵمان ) کە
کراوەتە ناوو درووشمی مرۆڤی مسوڵمانو
خواناس ، لەبەر ئەوە بووە کە ئەو
کەسەی ( ئیسلام ) ی هەڵبژاردوە بە
بەرنامەو پەیڕەوی ژیانی، مادام وابێ
بۆئەوەی مسوڵمانەتی ڕاستەقینە بێتەدی
وە لەنێوان ناوو نێوەڕۆک دا دژایەتی

نەبێ، پێویستە هەرکەسێک خۆی بە مسوڵمان لەقەڵەمدا، یەکسەر درووشمی (ئیسلامی) بوونیش هەڵبگرێو لە هەموو بوارو لایەنەکانی ژیانیدا بەس ئیسلامی بێو تەنیا لە سەرچاوەی ئیسلام هەڵێنجێ.

٢- دیاردەی گۆڕین (تحریف)و تێکدان و ناشیرین کردن، نەخۆشییەکە تووشی هەموو بیروباوەڕێک بووەو دەبێ، دیارە (ئیسلام) یش لەو یاسایە ڕیزپەڕ نیەو ئەمیش کەمو زۆر بەدەستی ئینسانی هەلپەرست و دین فرۆش، یان نەفامو بێ هۆش، دووچاری دیاردەی ناوبراو بووە.

جا ئێمە ئامۆژگاری دووەممان بۆ ئەو برادەرانەو بۆ هەر کەسێکی دیکەی مسوڵمان و ئیسلامخواز ئەوەیە، کە دوای ئەوەی بەرەو مسولمانەتی ڕاستەقینە گەڕانەوەو، ویستیان بە مەعنای وشە

ببنه ( ئیسلامی ) ، زۆر وریا و بێدارو دووربین و وردبین بن و ، به نه‌زانی به‌سه‌ر جۆره ئیسلامێکی تێکدراوو شێوێنراودا نه‌که‌ون و ، له ته‌ڵه‌و داوی هه‌لپه‌رست و دین فرۆش و نه‌فامانی بێ هۆش نه‌که‌ون !

به‌ڵێ هه‌ڵبژاردنی مسوڵمانه‌تی به‌سه‌ر نامسوڵمانه‌تی‌داو ، ئیسلامی بوون به‌سه‌ر نائیسلامی بوون دا ، چه‌ند گرنگ و جێ ی سه‌رنج و تێوه‌ڕامانه ، هه‌ڵبژاردنی ( خه‌ت و ڕێبازی ئیسلامی ڕه‌سه‌ن ) یش له به‌رانبه‌ر ( به‌ناو ئیسلامی ناڕه‌سه‌ن و قرپۆک ) یش دا هێنده گرنگ و بایه‌خداره .

جا ئێمه له هه‌ر دوازده ئاڵقه‌کانی زنجیره‌ی ( با چاکتر ئیسلام بناسین ! ) دا هه‌وڵمان داوه ئیسلامێکی ڕاسته‌قینه‌و بێ خلته له‌به‌ر تیشکی قوڕئان و سوننه‌ت و کتێب و به‌رهه‌می زاناو پێشه‌وایانی ڕه‌سه‌نمان دا بخه‌ینه‌ڕوو ،

وە ئەوەی لە زنجیرەی دوازدە ئاڵقەیی ناوبراودا گوتوومانە بەکورتی و گوشراوی لە دووتوێ ی نامیلکەی ( ڕێبازی پێغەمبەر کامەیە؟!) شدا.. خستوومانەتە ڕوو، (١) کە ئومێدم وایە دەورێکی چاکی هەبێ لە پێناسەکردن و خستنەڕووی ڕێبازی پێغەمبەرو صلى الله عليه وسلم ئیسلامی ڕەسەن و بێ خڵتەدا.

٣ـ خوای زانا فەرموویەتی :( ﴿ وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ الْبِرَّ مَنِ اتَّقَىٰ وَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا ..) البقرة / ١٨٩ . واتە : .. وە چاکەو مسوڵمانەتی ئەوە نیە کە لەپشتەوەڕا بچنەماڵەکانەوە، بەڵکو

---

(١) نامیلکەی ناوبراو ئاڵقەی یەکەمی زنجیرەی ( بووژاندنەوەی ئیسلام ) ە، کە سوپاس بو خوا لە چاپخانەی ( شەهیدانی گردی ڕەمکان ) چاپکراوە.

چاکەو مسوڵمانەتی ـ خەسڵەتی کەسێکە ـ کە پارێز بکات، وە لە دەرگاکانیانەوە بچنە ماڵەکان..

بەڵێ هەر شتە پێویستە لە ڕێی تایبەتی خۆیەوە، بۆی بچین، چونکە هەر خانووە دەرگای خۆی هەیەو، هەر دەرگایەش بە کلیلەی خۆی هەڵدەگیرێ، جا سێیەمین ئامۆژگاری و ڕێرووونی من بۆو برادەرە نوێ ئیسلامییانە ئەوەیە کە هەوڵ بدەن لە دەرگای تایبەتی و سروشتی خۆیەوە بەرەو ئیسلام بێن و، لەبەر تالووکەو پەلەپەل، یان لەبەر هەر مەبەستێکی دیکە !! لە پشتەوەڕاو لەدواوە بۆی نەیەن، چونکە لە حالێکی وادا سەرەڕای بەمرادنەگەیشتن، خۆشیان دەخەنە قەفەزی تۆمەتلێدان ( قَفَص الإتِّهام ) ەوەو، خەڵکی مسوڵمان و ژیریش لە خۆیان دڕدۆنگ دەکەن !!

با بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەست

وێنەیەک بێنمەوە :

بابایەک کە سەری لە شوێن کەوتنی ڕێچکەو بیردۆزە جۆراوجۆرەکان دا سپی کردووەو، بە درێژایی تەمەنی بێجگە لە ئیسلام پەنای بۆ هەموو شتێک بردووەو، جگە لە کابەی پیرۆز ڕووی لە هەموو قیبلان کردووەو، دەستی بە هەموو کونان دا کردووەو لەکوێ وە بای چاکی هاتبێ شەنەی خۆی کردووە، ئێستا ئەگەر بەڕاستی بیەوێ بەرەو خوا بگەڕێتەوەو، بۆن باوەشی ئیسلام بێتەوە، دەبێ لە شایەتمان هێنان و بە ئاشکراو بە ڕەسمی ڕاگەیاندن و دەربڕینی بیروباوەڕی نوێ ی کە (ئیسلامی) بوونە، دەست پێ بکات، نەک بچێ لە شتێکەوە دەست پێ بکات کە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە - ڕەنگە - لە پلەی سەدەمین دا بێت!!

ئنجا وەک پێشتریش گوتم کەسێک بە پێچەوانەی ئەمەوە کە ڕابرد ڕەفتار

بکات ، ئەوە با سوور بزانێ هەڵوێستەکەی لەگەڵ ڕووح و ماهیەتی بەرنامەی خـــوادا بەراوەژوویەوە ، جگە لەوەی کە بـــــەم ڕەفتارە خواروخێچەی هیچ بە هیچ ناکات ، وەک ئەو کەسەش دێتە بەرچاوی خەڵکی کە ئیمامی عەلی گوتەنی :

" لَبِسَ فَروَةَ الاسلامِ مَقلُوباً " پۆشاکـــی ئیسلامی بە ئاوەژووەوە دەبەرکردوە !!

ئیدی هیوادارم ئەم ئامۆژگاری یـــە برایانەو دڵسۆزانەیەم لێ وەربگیرێن و لە دڵیش بگیرێن .

# لەکۆتایی دا

لە کۆتایی ئەم نامیلکەیەدا بەوپەڕی پەرۆش و دڵسۆزیەوە ڕوو لە گەلـــــی کوردی مسوڵمان و هەر گەلێکی دیکـــەی چەوساوەو ژینتاڵ و ماڵ وێران دەکەم و ئەم چەند ئامۆژگاری‌و ڕێڕوونــــــــی ـ یانەیان وەک ( دیاری ) بەک پێش کەش دەکەم، کە ئومێدەوارم وەربگیرێن و لە دڵ بگیرێن و جێ بەجێ بکرێن :

یەکەم :

ئەوە کە شۆڕش و ڕاپەڕینــــــــە ئازادیخوازیەکانی ئەم دوایی بــــەی گەلی کورد لەسەر بنچینەی ڕێچکــــەو بیردۆزە ڕۆژهەڵاتی‌و ڕۆژئاوایی یەکــان بنیات نراون و، شۆڕشگێڕە کوردەکان بە بیری ( نائیسلامی ) گۆش کــراون ، زۆر

گران لەسەر گەلی کورد کەوتـــووە و ،
چاکترین بەروبەهانەی بە کافرو لامەزەب
لەقەڵەم دانی ئەو گەلە مسولْمانـــــە
وەدەست ڕژێمە چەوسێنەرەکان کەوتووە ،
کەواتە با پەند لە ڕابردوو وەربگرێنو
چیدی بە خرتوخۆڕایی ناوی گەلەکەمان
لەلای خەڵکی بەد نەکەین !!

دووەم :
با بێجگە لە ئیسلام و خەت و ڕێبازی
پێغەمبەرو چوار جێ نشینەکانی و هاوەڵانی
صلى الله عليه وآله وصحبه وسلـــــم
دڵ بە هیچ بیروباوەڕێکی دیکە خـــۆش
نەکەین و ، جگە لە قیبلەی ئیسلام ڕوو
لە قیبلەی هیچ بیروباوەڕێکی دیکـــە
نەکەین ، دەنا دڵنیابین بەس خۆمـان
دەسخەڕۆ دەکەین و ، دەغڵی پاکــــی
هەوڵدانمان بە بیابانی ئیشکی بـــێ
بەرهەمی وەردەکەین !!

سێ یەم :

با زۆر چاک بزانین کە ئیسلام بەرنامەو پەیڕەوی سەرلەبەری ژیانەو توانای چارەسەرکردنی هەموو دەردو گیروگرفتە سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریەکانی هەیەو، هەرکەسێکیش بڕواو قەناعەتی ئاوانەبێو، پێی وابێ یەک یاسای ئیسلام هەڵەو ناتەواوە ئەوە لە ڕیزی موسڵمانان دەچێتەدەرێ و، لە ئەهلی قیبلە دەشۆرێ !!

چوارەم :

ئەم بارودۆخو واقیعە پڕ ئێش و ژان و دژوارەی ئێستامان لەگەڵ لەبەرچاو گرتنی واقیعی شێواو تێکچووی فیکری و دەروونیو ئەخلاقیمان کە وەدوای ڕێچکان کەوتن و خۆ بە دوژمن فرۆشتن زەقترین بەڵگەو نیشانەی ئەو شێوان و تێکچوونەن ، ئەوە زۆر بە شتێکی

سروشتیو چاوەڕوان کراوو سزاو تۆڵەیەکی پڕبەپێست دادەنرێ و، با هیچ کەس بە نەزانیو سەرکێڵی گلەییو گازندە لە خواو ئیسلام نەکات و، بە نەفامی خۆی کافر نەکات، چونکە هەر بەهۆی خراپەو تاوان و لادانەوە ڕۆژمان بەم ڕۆژە گەییو، با زیاتریش قوڕەکە بۆ خۆمان خەست نەکەین !!

پێنجەم :

با بەپێی فەرموودەی خوا کە دەفەرموێ : (إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ) هەوڵی گۆڕینی واقیعی ژیانمان بدەین ، بەهۆی گۆڕینو چاککردنی حاڵ و واقیعی دەروونی و فیکری و ئەخلاقی مانەوە، وە با چیدی لەبەر دانیە هەڵەو تاوانی خۆدا نەهێنان دەستی پیسی خۆمان بە خەڵکی نەسڕین و، چیدی بە ناهەق یەخەی خواو

پێغەمبەرو ئیسلام و قەزا وقەدەر نەگرین!!.

شەشەم :

با زۆر چاک دڵنیا و مسۆگەر بین کە هیچ کاتێک شیفای دەردو نەخۆشییەکانی ئێمە ناگونجێ لەسەر دەستی کەسانێک بێ کە جارێ خۆیان پێ چاک نەکراوەو، هەتا ئێستا بە کەڵکی خۆشیان نەهاتوون !!

چونکە کوردان گوتوویانە :

" کەچەڵ ئەگەر توانیبای سەری خۆی دەرمان دەکرد ".

وە بەدەردی عارەب دەڵێن :

" فاقِدُ الشَّئِ لایعطیه " نەدار پێی نابەخشرێ .

ئەوانەش کە لافی رابەرایەتی و چاوساغیی گەلێکی موسوڵمانی وەک کورد لێ دەدەن ، بەڵام لەولاشەوە دژی ئیسلام قسەدەکەن ، ئەوە پێویستە نیشانەی پرسیارو سەرسوورمان(؟!) یان لە بەرانبەردا دابنرێ !!

حەوتەم :

تێروتەواوی و بێ پەڵەیی ئیسلام بەرهەمو ئەنجامی سروشتی چاکیو پاکی و تەواوی ی خوایەو، پڕ هەڵەو پەڵەیی ڕێچکانیش، ئەنجامی حەتمیو چاوەڕوان کراوی سروشتی بێ هێزو ناتەواوو سنووردا ری مرۆڤە، چونکە گۆزە چی تیدا بێ هەر ئەوەشی لە دەڕژێ و،.... پەرداخیێکیش هەر لەقەدەر خۆی ئاو دەگرێ !!

هەشتەم :

ئیسلامی بەرزو مەزن وەک بەرنامەو پەیرەویێکی سەرتاسەری ژیان، مێژوویەکی دەوڵەمەندو پڕ تەجرووبەی (١٤٠٠) ساڵەیی هەیە، کە دەیان تیرەو گەلی پێ بەمراد گەیشتوون و، دەیان دەوڵەتی پێ دامەزراون و، بە پلەوپایەی بەرزی شارستانەتی گەیشتوون ، بەڵام ڕێچکەو

بیردۆزەکان زۆربەیان بەس بیردۆزە ( نظریە ) ی ڕووتن و، جێ بەجێ کران ( تطبیق ) یان بەخۆوە نەدیوەو، ئەگەر گریمان جێ بەجێش کرابن، جگە لە خاکەساری و زینتالی‌و خراپەو ئاشووب هیچی دیکەیان لە هەگبەدا نەبووە !!

نۆیەم :

کەواتە با ئێمەش وەک زۆربەی گەلانی جیهانی ئیسلامی، جارێکی دیکەش بەمەبەستی دەستگیرکردنی ڕەزامەندی خواو، جێ بەجێ کردنی ئەرکی سەرشان و ڕزگارکردن و بووژاندنەوەی گەلی بێ شوان و، ئاوەدان کردنەوەی وڵاتی وێرانمان، قۆڵی مەردایەتی لێ هەڵبکەین و چاک و چەکی جیهادی لێ بەلادا بکەین و، لەژێر دروشمی ( ئیسلامی ) بوون دا کۆشکی زوڵم‌و ستەم‌و خراپەو بێ دادی بڕووخێنین و، زۆردارو

ملهوڕان بڕەتێنین و، چەوساوانیــــان لەچەنگ دەرێنین و، دادگەریو ئازادی و خێروخۆشیو بەختەوەری لەنێو خەڵکی دا بڕەخسێنین و فەڕاهەم بێنین.

دەیەم:

دوایین ئامۆژگاریشم ئەوەیە:

کە ئێمە بەمەرجێک بەڕاستی بۆ خوان ساغو یەکلا بینەوەو، ئامانجو مەبەستما بەس ڕازی کردنی خواو بووژاندنــــەوەی ئیسلام بێ، ئەوە با مسۆگەر بین کە خوا پشتی دۆستانی خۆی دەگرێ و بەســـــەر ناحەزان و دوژمنانی خۆی و خۆیـــان دا سەریان دەخات و، ڕاستەوخۆ مشوور لــــە کاروباریان دەخوات.

ئیدی دەست لەدەست و قوەت لە خوا.

وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّــــهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ.

٢٧ ذو القعدە ١٤٠٩

# ناوه‌ڕۆك

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |


وقل جاء الحق

وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ
مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ
يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ

الأنبياء ١٠٥